## له جیاتی پێشەکی

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز
بە کوردی گەر بنووسرایە زوبانی
مەلا و شێخ و میر و پادشامان
هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانی

حاجی

کـــوردە دەزانی لە کـــویّ جـــێگرە خـــزمـــانی تۆ

گـــویّ گـــرە بۆتی بڵـــێم جـــێگەی خـــێـــڵانی تۆ

کـێوی تۆرۆس و عـومـقی حـوزەی ئەسکەندەروون

غـــەربیـــە تا بەحـــری رەش سنووری مـــەیدانی تۆ

بەحـــری رەش و ئەردەهان ئاوی ئاراســـە بزان

حـــەدی شـــیـــمـــالە ئەمـــە بۆ کـــۆچ و جـــەولانی تۆ

ئەلوەن و گـــۆلی ورمێ تا ســـەری ئاوی ئاراس

سنووری رۆژهەڵاتە حـــەبووەکـــە و کـــێـــوانی تۆ

هەوراز و کێوی حەمرین، ژەنگار و ڕێی نووسەیبین

سنوورە بۆ جنووبی: باخـــچـــەی و باغـــانی تۆ

لەنـــاو ئەم ســـنـــوورەدا دووانـــزە ویلایـــەت هـەیـە

دەڵێن دووانزە ملیـــۆنە نفـــووسی کـــوردانی تۆ

حـــاشـــا درۆیە وترا نفـــووســـیـــان نەنووســـرا

دەگاتە بیست ملیـۆن گەر بنووسریّ قەومـانی تۆ

عەبدولخالق ئەسیری

کۆواری «هاوار»، دیمەشق: ١٩٣٢، ژ (١١)، ل (١٤)

دەروازەی یەکەم

# کرۆنۆلۆجیای کوردستان

لە دێرینەوە تا ١٥١٤



ئاسەواری هەخامەنشینەکان

## ژیانی سیاسی

### ٩٠٠٠ - ٨٠٠٠ پ.ز

مرۆڤ بۆ یەکەم جار لە مێژوودا، لە کوردستان، لە ئەشکەوت و مەڵبەندەکانی کەریم شایەر، زاوی چەمێ، شانەدەر، هەزار مێرد، مەڵبەندی چەرمۆ، چەتاڵ هۆیووک.. کشتوکاڵ دەکات و نیشتەجێ دەبێ، مەڕومالآت بەخێو دەکات و رووەک پەروەردە دەکات.

دواتریش لە گەنج دەرە لە کوردستانی ئێران و لە تەل ئاسیاب لە نزیک کرماشان لە ٨٠٠٠ - ٧٥٠٠ دا.

– مەڵبەندی (زاوی چەمێ)، ٤کم لە رۆئاوای ئەشکەوتی شانەدەر، بە کۆنترین مەڵبەندی نیشتەجێبوون لە کوردستانی عێراقدا دەژمێردرێ. یەکەمین شوێن کە ئاسەوارەکانی ئەم قۆناخەی چاندنی تێدا دۆزرابێتەوە بریتییە لە ئەشکەوتی (زەرزی)ی سەر بە سلێمانی. لەم ئەشکەوتەدا کۆمەڵێک ئامێری بەردینی ورد کە شێوەی ئەندازەیی جۆراوجۆریان هەبووە و بۆ دروێنە دانەوێڵە و راو بەکار هاتوون.

ئەم قۆناخە پیشەسازییە لە مێژووی کۆنی عێراقدا ناوی لێ نراوە پیشەی زەرزیی (الصناعة الزرزية)، ئەمەش لەبەر ناوی ئەشکەوتی زەرزی.

گەندووک، نزیک ئاکرێ چەندان نیگاری راوە نێری و پەیکەر و بەردتاشی و نەخش و وێنەی هەڵکۆڵدراوی لەناو ئەشکەوتەکەیدا دۆزراوەتەوە کە (سێر ئەی. ئێچ لایارد) لە کتێبی (نەینەوا و بابل) ١٨٥٠ چاپ کراوە دەڵێ کە مێژوویان بۆ سێ هەزار ساڵ بەر لە مەسیح دەگەڕێتەوە.

## ژیانی کولتووری

### ٩٠٠٠ - ٨٠٠٠ پ.ز

دوای سەرهەڵدانی کشتوکاڵ لە کوردستاندا (لە شانەدەر و هەزارمێرد و زاوی چەمێ)، سیرامیک (فخار) بۆ یەکەمین جار لە مەڵبەندی چەرمۆ دروست دەکرێ و پاشان لە تەپەگۆران لە کوردستانی ئێراندا.

سیرامیکەکانی مەڵبەندی چەرمۆی کوردستانی عێراق زەوینەیەکی زەردیان هەبووە؛ بە ڕەنگی سوور نەخشیان لەسەر کراوە. هێڵەکانیان یەکتربڕ بوونە. بە (سیرامیکی بۆیەکراوی چەرمۆ) ناسراون.

ئەشکەوتەکانی هەزارمێرد لە (دەشتی بەرانانی نزیک سەرچنار لە سلێمانی) و شانەدەر (لە ناوچەی برادۆستی سەر بە هەولێر) و تەل حەلەف (لەسەر سنووری باکوری عێراق – سووریا) و گەنج دەرە لە کوردستانی ئێران و تەل حەسوونە ؛ گرینگترین ئەو مەڵبەندانەی کوردستانن کە سیرامیک تێیاندا بڵاو بووەتەوە و پەرەی سەندووە.

ئەو کۆمەڵە نەخش و نیگارانەی لە (ئەشکەوتی کچە کەنجەکان) لە گوندی یەدی سالکیم لە مەڵبەندی ئەنادۆڵ (٧٦کم لە باشووری رۆژهەڵاتی شاری وان) دۆزراونەتەوە و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٨٠٠٠ پ. ز، مشتێکن لە خەرواری ئەو گەنجینە وێنەییانەی سەردەمە بەردینەکانی کوردستان.

زۆربەی ئەو نیگارانە بە ڕەنگی سوور یان قاوەیی کێشراون. بەشێکیان بریتین لە ژنە خواوەندەکان لە کاتی سەماکردندا، یان خواوەندی تر کە لەسەر پشتی گیانلەبەراندا وەستاون، یانیش تەنیا وێنەی ئەو گیانەوەرانەی کە تاکو ئەمڕۆش لەسەر فەرشە کوردییەکاندا وێنەیان دەبینین. بەشێکیشیان بریتین لە دیمەنی شکار و ڕاو، هەندێکیشیان ئەو تەداردکە (طقوس) دینییانەمان بۆ دەگێڕنەوە کە مرۆڤی ئەو چاخە لەناو ئەشکەوتەکەدا سازیان کردووە.



برۆنزەکانی لوڕستان لە سەردەمی "**میدیا**"

## ژیانی سیاسی

### ٢٣٥٠ - ٢١٥٩ پ. ز

ئەکەدییەکان بە سەرکردایەتی سەرگۆن پاشا، توانییان دەسەڵاتی خۆیان لە کوردستانی عێراقەوە تا ئەنادۆڵ درێژ بکەنەوە. پایتەختیان برێتیی بوو لە شاری (ئەکەد) کە دەکەوێتە ناوەڕاستی عێراقی ئەمڕۆ. ئیمپراتۆریەتی ئەکەدییەکان سەرگۆن پاشا بووە.

- سەردەمی نەرام سین پاشای ئەکەدی (٢٢٩١ - ٢٢٢٥)



نەراسیم سین

## ژیانی کولتووری

### ٢٣٥٠ ٢١٥٩ پ. ز

لە سەردەمی ئەکەدییەکاندا، زمانی سۆمەری بەکار هاتووە.

دیارترین بەرهەمە هونەرییەکانی ئەکەدییەکان لە کوردستاندا برێتییە لە نەخشە هەڵکەندراوەکانی (ئانۆ بانینی) لە نێوان کرماشان و قەسری شیرین، هەروەها نەخشە هەڵکەندراوەکانی (دەربەندی گاور) لە باشووری قەرەداغ، کە چەندان وێنەن، یەکێک لەوانە شەڕوانێکی ریشن کەوانێکی لە دەستە و (١٠) پێ بەرزە، لەگەڵ نەحت و نەخشە زێڕینەکان، هەڵکۆڵدراوەکانی سەر بەرد کە پڕن لە وێنە و خواوەند و شەخسیات. لە گوندی (گوندۆک)ی سەر بە ئاکرێ دۆزراوەتەوە و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پ . ز .

هونەری شێوەکاری لە سەردەمی ئەکەدییەکاندا، بە چەند خاسیەتێک دەناسرێتەوە:

١- بەکارهێنانی برۆنز بۆ دروستکردنی پەیکەر و پارچە هونەرییەکان زیاتر و زۆرتر دەبێت. هەروەها تەکنیک و چۆنیەتی مامەڵەکردنیش لەگەڵ میتاڵەکان پەرە دەسێنێت. ئەمە جگە لە پەرەسەندنی کاری سیرامیک.

٢- نوێکاری و ڕەنگرێژی و جۆراوجۆریەتیی تەکنیک و کەرەستە و بابەتەکان . «هیچ بابەتێک نەبوو لە یەکێکی تر بچێت لە رووی جووڵە و دەربڕین و وردەکارییەکانەوە.

٣- پەیکەرتاشی و هەڵکەندن و نیگارە ئەکەدییەکان، وێنەی خەڵکیان، بەپێچەوانەی سۆمەرییەکان، وەکو خۆیان و لەسەر شێوەی خۆیان - دوور لە ملکەچی بۆ پاشا و دوور لە نزمی و بەندەیی - ڕەسم دەکرد. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە گوێیان نەداوەتە دین و دەسەڵاتی پاشا.



ئەم وێنەیە سەنحاریب پاشا پێشان دەدا لە سەردەمی ئاشووری، کە ئاوی بۆ هەولێر راکێشا

میتانییەکان کە لەگەڵ هیندۆئەورووپییەکان لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمدا (١٥٠٠- ١٤٠٧ پ. ز) هاتنە کوردستان و تێکەڵ بە خوورییەکان بوون، هونەر و ئاسەوارێکی زۆریان لە کوردستاندا جێ هێشتووە. شاری نووزی، نزیک کەرکووک، مەڵبەندی میتانی و خوورییەکان بووە. سیرامیکی زەغرەفەکراوی پڕ لە وێنەی لێ دۆزراوەتەوە، هەروەها ئەختامی لوولەییی جۆراوجۆر کە پێکهاتەی شێوەکاریی نامۆیان هەیە. ئەمە جگە لە نیگار و نەخشی سەر زێڕ و بەرد و پەیکەردکانی گوندۆک لە ئاکرێ.

## هەزارەی یەکەمی
## پێش لەدایکبوونی مەسیح

**٢٠٠٠- ١٥٠٠ پ. ز**

- شارستانیەتی ئاشوورییەکان لە کوردستاندا.
- دوایەمین پاشای ئووری سۆمەری.

**١٥٠٠ پ. ز**

- ئیمپراتۆریەتی میتانی لە ناوچەکانی مووش و بەتلیس.

**١٣٩٢ پ. ز**

- سەرهەڵدانەوەی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری

**٩٥٠ پ. ز**

میرنشینی ئارامییەکان لە تەل بەرسیپ.

- لە هەزارەی یەکەمی پێش مەسیحدا، زۆربەی ناوچەکانی ئەو هەرێمە، پاش لەناوچوونی دەوڵەتی میتانیا، کەوتبوونە ژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی نوێی ئاشووری کە ساڵی (٩١١ پ. ز) سەری هەڵدابووەوە.

د. جەمال رەشید:

لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری

**٨٢٥ و ٨٣٦ پ. ز**

ناوهاتنی میدیاییەکان (مێدەکان Medes)، وەک کۆمەڵە هۆزێکی کۆچەر، لەناو تۆماری ئاشوورییەکاندا As-syraennes .



## هەزارەی یەکەمی
## پێش لەدایکبوونی مەسیح

**٢٠٠٠- ١٥٠٠ پ. ز**

- نامە بە زمانی ئەکەدی لە شمشارەی دەشتی رانیە.
- نووسینی بزماریی سەردەمی ئاشووری.

**١٥٠٠ پ. ز**

- زمانی میتانی لە سەدەی ١٦ پ. ز دا بووبووە زمانی فەرمیی چینی دەسەڵاتدار و وڵاتی میتانیا.

- خەمڵانی زمانێک یان چەند دیالێکتێک کە دەبن بە سەرچاوەی زمانی کوردیی ئەمرۆ (جگە لە کوردی هیچ زمانێکی تر نییە بتوانێ خۆی بە میراتی میتانی بزانێ. د. جەمال رەشید).

- سەرەتای زمانی کوردی لە هەزارەی دووەمی پێش مەسیحدا، پاش موتروبەبوونی بە زمانە ناوچەییەکان و کاریگەربوونی بە زمانەکانی ماد و میتانی و سکیث و کیمیری و ئالان و تێکەڵاوبوونی بە کولتووری یۆنانی و ئارامی لە رێگەی دەسەڵاتداریەتیی رامیاری و ئاینییەوە، ئەو ئەنجامەی پێ گەیاندووە کە لە هەزارەی یەکەمی پ. مەسیحدا دانیشتووانی کوردستان پێی دوان؛ ئەو زمانەش دەتوانرێ پێی بگوترێت (شێوە کۆنەکانی زمانی کوردی) چونکە پێوەندییەکی راستەوخۆیان لەگەڵ کوردیی ئەمرۆدا هەیە.

بەپێی شیکردنەوەی ئەو نووسینانەی کە لە هەزارەی یەکەمی پێش مەسیحدا لە کوردستاندا نووسراون، دەتوانرێ هەست بە زمانێک لە کوردستاندا بکرێ کە لە سەرەتای چەرخی مەسیحەوە لەلایەن دانیشتووانی ئەم وڵاتەوە بەکار هاتووە.

لە هەزاردی یەکەمی چەند گۆڕانێکی کەڵچەری و زمانەوانی لە سەردەمی دەوڵەتی میتانی و میدیاییدا روو دەدەن و هەر لەم پلەیەدا هەموو مەرجێکی پێویست بۆ پەیدابوونی نەتەوەی کورد دێتە کایەوە. شاری هەولێری

## ۷۰۱ی پ. ز

سەنحاریب پاشای ئاشووری، فەرمانڕەوای هەولێر، ویستوویەتی مەڵبەندی لاکش ئابڵووقە بدا بۆ ئەوەی ئوورشەلیم کۆنترۆڵ بکا و بتوانێت دەستی خۆی بگەیەنێتە میسر. بابەتی ئەم ئابڵووقەدرانەی لاکش لەلایەن سەنحاریبەوە، لەلایەن نیگارکێشێکی ئەو سەردەمەی هەولێر کێشراوە و ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیا پارێزراوە.



خواوەندی "ژن"
کە لە کوردستان پیرۆز بووە



ئێستا یەکێک بووە لە مەڵبەندی ئەو ناوچانەی گۆڕانکارییەکانی تێدا ڕوو داوە.

د. جەمال ڕەشید.

لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری

گرینگترین بەرهەمەکانی ئاشوورییەکان لە کوردستاندا برێتین لەوانەی (خورساباد) کە دەکەوێتە باکوری مووسڵ، لە تەنیشت (دور شارکین): چەندان دیواربەند و شوورە و دەروازەی پاشایەتی و کۆشک و تەلار و پەرستگای ڕازاوەی وێنە لەسەر کێشراون. هەروەها شارۆکەی کۆیە ژمارەیەکی زۆر لە پەیکەر و دیواربەند و بەرهەمە دیتەنییەکانی ئاشوورییەکانی تێدا دۆزراوەتەوە، لەوانە: دیواربەندی شێرێکی بریندار، کە لە مۆزەخانەی بەریتانیدا پارێزراوە و لە قەسرێکی ئاشووربانیپاڵ دا دۆزراوەتەوە. ئەرنست بابلۆن، ئەم شێرە برینداره بەراورد دەکات بە جوانترین بەرهەمی یۆنانییەکان. شێرەکە بە سێ تیری ڕاوچییان پێکراوە و هێزی خۆی لەسەر هەر دوو قاچی پێشەوەیدا کۆ کردووەتەوە.

هەروەها ژمارەیەک بەرهەمی دیتەنی و دیواربەند و تابلۆی تریش لە مەڵبەندی (ئاشوور)ی نزیک هەولێر و لە دەربەندی گۆمەل (ناوچەی خنس لە باکوری مووسڵ ) و (قەسری سەنحاریب) و (تەل بەرسیپ) کە شاندێکی فەڕەنسی لە ۱۹۳۱ دۆزیانەوە (لە کوردستانی سوریا) دۆزراونەتەوە.



محمد پدرام (تمدن مهاباد، طهران: ١٩٩٤) پێی وایە کە ئیمپراتۆری ماننا لە نزیک گوندی حەسەنلوو لە ڕۆژاوای دەریاچەی ورمێدا بووە، کە لە ٤٥ کیلۆمیتریی باکوری ڕۆژاوای شاری مەهابادە؛ (هاوکات لەگەڵ هەڵدانەوەی دوو چینی چواردەم و پێنجەمی گردی حەسەنلوو قاپە بەناوبانگەکە دۆزرایەوە) هەروەها بەم زووانە شوێنەواری قەلایچی لە نزیک بۆکان دۆزراوەتەوە کە دەردەخا ناوەندی ئەم ئیمپراتۆرە بووە. لە ٨٢٨ پ. ز دا سالمانەسر ئیمپراتۆری بەهێزی ئاشووری چەند جار بۆ سەر ئەم ناوچە ناسراوانەی ئەو کاتی دنیا لەشکرکێشی کردووە و فەرمانی هێرشی داوە بۆ سەر وڵاتی ماننا و ناوەندی ئەم وڵاتە قەلایچیی ئێستا.

## دەوڵەتی میدیا
## ٦٢٥ پ. ز - ٥٥٠ پ. ز

### ٦٢٥ پ. ز
### دەوڵەتی میدیا

- مێدەکان دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان بە ناوی (میدیا) دادەمەزرێن کە تا ساڵی (٥٥٠ پ. ز) بەردەوام دەبێ.

میدیاییەکان کە بۆ یەکەمین جار ناویان لە شێوەی ئامەدی لە ساڵی ٨٣٦ - ٨٣٨ پ. ز دا لەناو نووسراوی پاشای سەلمان زاری سێیەمی ئاشوورییەکاندا دەردەکەوێ، دەسەڵاتیان لە باشووری دەریاچەی ورمێ بەولاوە درێژ دەبووەوە تاکو ئەکباتان (هەمەدان) کە پایەختیان بوو.

دیاکۆ، یەکەم پاشای میدییەکان، هاوپەیمانی ئیمپراتۆریەتی ئوورارتۆ، دژی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری وەستا؛ تا لە کۆتاییدا سیاکار دەوڵەتی میدیای لە ٦٥٠ پ. ز دا دامەزراند.

- لە هەمان سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی میدیادایە (٦٢٥ پ. ز) کە زەردەشت پێغەمبەر ئاینی زەردەشتی بڵاو دەکاتەوە: لە ڕێگەی کتێبی پیرۆزی (ئاڤێستا)وە داوا لە گەلەکەی خۆی دەکا دەست لە ژیانی کۆچەری هەڵبگرن، بەرەو بنەگر بوون و کشتوکاڵ و ژیانی شارنشینی هەنگاو بنێن. ئەمەش دەبێتە هۆیەک بۆ پێشکەوتنی کولتوور و ژیانی ڕوحی و کشتوکاڵ و پیشەسازیی دەست و خانووبەرەسازی (ئارشیتێکتوور) لەناو کورددا.

میدیا لە نووسینە مێخییەکانی بێستوونیشدا دووپات کراوەتەوە و ئەوەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە کە میدیا سەرپەرشتیی ژیانی دینیی هۆزەکانی تریشی کردووە.

### ٦٢٣ پ. ز

میدیاییەکان لە شەڕێکدا ناتوانن نەینەوا داگیر بکەن



## دەوڵەتی میدیا
## ٦٢٥ پ. ز - ٥٥٠ پ. ز

### ٦٢٥ پ. ز
### دینی زەردەشت هاوزەمانی دەوڵەتی میدیا

- لە سەردەمی میدیاوە تا داگیرکرانی کوردستانیش لەلایەن ئیسلامەوە، گۆرانیی (هۆرە) بۆ ستایشکردنی ئاهورامەزدا لە مەڵبەندی هەورامان و کرماشان و ئیلام و لوڕستان گوتراوە. هاوزەمان (گاتا) زەردەشتییەکانیش باو بوونە کە لە سەردەمی دەرکەوتنی زەردەشت پێغەمبەرەوە دەرکەوتوون.

- گاتاکان (گاث یان گاز، واتە بانگ)، سرورودی دینیی زەردەشتی بوون، پێشیان گوتراوە (یەسنا) کە ژمارەیان (٧٢) یەسنا (سروود) بووە و کێشی برگەیی (هیجایی)یان هەبووە؛ ئامێری مۆسیقاییان دەگەڵ بەکار دەهات و لەلایەن مووغ و سترانبێژەکانەوە لە کاتی شادی و پرسەکاندا یان لە بۆنەکانی تردا، هەروەها لەناو پەرستگاکانی خۆشیاندا بەدیار ئاگرەوە، بە ئاواز دەگوترانەوە. ئەهلی حەق ئەمڕۆ بەو یەسنا دە برگەییانەی خۆیان کە لە جەمخانەکاندا بە ئامێری تەمبوورەوە دەیڵێنەوە، دەڵێن (یارسان).

بەهەشت لە دینی زەردەشتدا، وەک بەهەشتی دینی ئیسلام نییە حۆری و جۆگەی هەنگوینی لێ بێ، بگرە تەنیا جێگەی ساز و ئاواز و گۆرانی و مۆسیقایە.

لە ئاڤێستادا داوا کراوە کە گاتا پێویستە بە ئاوازەوە بخوێندرێ ئەگینا نوێژەکانیان قبووڵ نابێ.

هێرۆدۆت (٤٨٦- ٤٢٠ پ. ز) لە بارەی قوربانی بردن بۆ خواوەندەکانی (ماد) دەڵێ: «مووغەکان خۆیان سەرپەرشتی ڕێوڕەسمەکانیان دەکرد و سروودی تایبەتیی خواوەندیان دەچڕی»؛ «مووغە زەردەشتییەکان لە کاتی نوێژدا ئاوازیان دەژەند و گۆرانییان دەگوت».

بۆ پەرستنی (ئاگر)، دەبوایە لەسەر چیای بەرز و لەناو پەرستگەکاندا (قوربانی)یان بۆ خواوەندی ئاگر ساز بکردایە، کە ئەم پەرستگایانەش دیسان هەر لەلایەن

## ژیانی سیاسی

**٦٢٠ پ. ز**

میدیاییەکان لەشکری خۆیان بەهێز دەکەن و لە ٦١٥ (ئاراپخا - کەرکووکی ئەمڕۆ) دەگرن.

**٦١٤ پ. ز.**

هاوپەیمانیی میدیایی و بابلییەکان ، شاری (ئاشوور)ی نزیک هەولێر دەگرن.

**٦١٢ پ. ز**

میدیاییەکان نەینەوا دەگرن.

**٦٠٩ پ. ز**

خەڵکی میدیا (حەڕان) و (تووشاپا)ش دەگرن، ئنجا هەندێ مەڵبەندەکانی ژێردەستی ئورارتۆش دەخەنە ژێر دەستی خۆیان.

**٥٨٠- ٥٢٩**

کوورووشی گەورە، برای سیرووسی هەخامەنشی، وڵاتی ماد و پارس یەک دەخات.

## ژیانی کولتووری

ڕێبەرانی ئاینی (مووغ)ەوە سەرپەرشتی دەکرا، کە دواتر ئەم موغانە بوونە نوێنەرانی (ئاگرپەرست) و لە زمانی عەرەبی و عیبریدا (مەجوس)یان پێ گوترا.

جگە لە قوربانیکردن بۆ خواوەندانی سروشت، پەیکەر و بتیشیان بۆ دروست کردوون. شێوەی ئەم بت و ئەفسانانەی پێوەندییان بەم خواوەندانەوە هەبووە، لە وێنەی ئەو پەیکەر و بەردەنووسانەدا دەردەکەون کە لە (زێوێ)ی نزیک شاری (سەقز)ی کوردستانی خۆرهەڵاتدا دیتراونەتەوە. لەم وێنە و پەیکەرانەدا فەلسەفەی خواوەندی (ئاوەڵ دووانە- جمکانە) بەرجەستە کراوە: بەرجەستەکردنی (چاکە)، لە شێوەی سەگێکدا و (خراپە)یش لە شێوەی مارێکدا سومبولبەندی کراون و هەردووکیان لە وێنەی مارێکی سەگسەردا پێکەوە لکێنراون.

بەشێک لە گەنجینە هونەرییەکانی (زێوە / زێوێ) و برێک لە برۆنزەکانی لوڕستان (لە کوردستانی ڕۆژهەڵات) دروستکراوی دەستی میدییەکانن.

وێنەی سەر توحفەکانی (زێوێ)، زۆربەیان برێتین لە ئاژەڵی ئەفسانەیی. ئەمەش لێکچوونێکمان بۆ دەردەخات لەگەڵ برۆنزەکانی لوڕستان. دیارە کە دوو تیرەی سەر بە یەک نەتەوەی میدیایی دروستی کردوون.

ناودارترین هونەرە دیتەنییەکانی لوڕستان، برێتین لە (برۆنزەکان) کە ناوبانگێکی هونەری و مێژوویی فراوانیان هەیە. زۆربەشیان هەڵگرتەنین، واتە مرۆڤ دەتوانێ لەگەڵ خۆیدا هەڵیان بگرێت، کە ئەمەش لەگەڵ سروشتی ژیانی ڕەوەندی و پێداویستییەکانیان دەگونجێت هەروەها لەگەڵ قەوارەی گۆڕەکانیشیان.

بەشێکی ئەو برۆنزانەی لوڕستان دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی (٧ - ٨ پ. ز) کە کاریگەریەتیی پێشکەوتنی پیشەسازیی میدیاییەکانی پێوە دیارە. ئەوانی تریش دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی ١١ - ١٢ پ. ز.

هێرۆدۆت، مێژوونووسی گریک، لە فەسڵی ٩٨ی کتێبی یەکەمی مێژووەکەیدا، بەفراوانی باسی کەشخەیی میعمار و هونەری ڕەسمکردنی کۆشک و تەلارەکانی میدیاییەکانمان لە هەمەدان بۆ دەکات.



خواوەندی "عەشتار" لە هەولێر
لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا



برۆنزی لورستان
لە سەردەمی "میدیا"

ژیانی سیاسی

## هەخامەنشییەکان

**٥٥٠ پ. ز - ٣٣١ پ. ز**

**٥٥٠ پ. ز**

هەخامەنشییەکان Achemenides واتە ئەخمینییەکان لە باشووری ئێرانی ئەمڕۆدا کە دەسەڵاتیان فراوانتر دەبێ، دەوڵەتی میدیا دەخەنە ژێر رکێفی خۆیان و ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی دادەمەزرێنن؛ بەڵام هەمان دینی میدیاییەکان (زەردەشتی) باو دەمێنێتەوە. بەم شێوەیە دەوڵەتی میدیا کۆتایی پێ دێت، بەڵام زمان و کولتوور و دینەکەی (زەردەشتی) دەمێنێتەوە.

- دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی (ئەخمینی) لە ساڵی (٥٥٠ پ. ز)دا ئیمپراتۆریەتی میدیای شکاند و خۆی دامەزراند،

- داریووش پاشای یەکەم لە ساڵی ٥٢٢( پ. ز)دا جڵەوی حوکمی گرتە دەست.

- دوای ئەمە ئیتر ژمارەیەک ڕاپەڕین و شۆڕش لەلایەن میدیایی و نوورارتوویی و بابلی و عیلامییەکانەوە دژی داریووش سەری هەڵدا. بەڵام داریووش توانی هەموویان سەرکوت بکا؛ ئنجا هات ئەم سەرکەوتنە مێژووییەی خۆی لەسەر کەلەکی شاخی بێستوون لە نزیک کرماشان تۆمار کرد: لەسەر دیوارێکی ٦ مەتر درێژی و ٣ مەتر بڵندی. (١٣) زەلام لە نەخشەکەدا دیارن، (١٢) وەستاون، یەکێکیش لەسەر پشت، لەژێر قاچی داریووش دەپارێتەوە. هەموو ئەو زەلامانەی کە بەرامبەر داریووش وەستاون: ٩ کەسن، سەرۆکی ئەو گرووپانەن کە شۆڕشیان دژی داریووش هەڵگیرساندبوو، ئێستاش وەک لە تابلۆکەدا دەبینین: دەستبەستراو، بەدیل گیراون. لە سەردووەی هەموویشیاندا (ئاهورامەزدا) دیارە.

- سیرووسی دووەم، پاشای ئەخمینییەکان (٥٥٩ - ٥٣٠ پ. ز) لە (٥٤٩ پ. ز) ئەکباتان (هەمەدانی ئەمڕۆ)ی ئیمپراتۆریەتی بابل دەگرێت و کۆتایی بە دەسەڵاتی بابلییەکان و میدیا دێنێ.

ژیانی کولتووری

## هەخامەنشییەکان

**٥٥٠ پ. ز ٣٣١ پ. ز**

**٥٥٠ پ. ز**

زمانی پارسیی کۆن (هەخامەنشی، واتە ئەخمینی) زۆر سوودی لە زمانی ماد «وەک زمانێکی ئاینیی پیرۆز» وەرگرتووە. ئەخمینییەکان تەنانەت نووسینی بزماریشیان لە میدیاکانەوە وەرگرتبوو،

جگە لە زا راوە دینی و سیاسییەکانی میدیاییەکان، بەهەمان شێوە دینی مەزداییش، کە دیانەتی میدییەکان بوو، ئەخمینییەکان لێیان وەرگرتبوون.

مێژوونووسە یۆنانییەکان (هێرۆدۆت و گەزنەفۆن) باسی دەکەن پارث و هەخامەنشی و ساسانیەکان هەمان دەستووری پۆشاک و شێوازی لەبەرکردنی جلوبەرگی میدییەکانیان بەکار هێناوە.

لە پێنج ستوونەکانی سەر تابلۆکەی (کەلەکی شاخی بێستوون لە کرماشان) داریووش پاشای هەخامەنشی (ئەخمینی) دەڵێ کە «ئاهورامەزدا پاشایەتی داوە بە ئەو»، «بۆیە ئەگەر دژایەتیم بکەن ئاوها دیلتان دەکەم و ئاهورامەزداش نەفرەتتان لێ دەکات». داخوازیش لەو کەسانە دەکات کە دوای خۆی دێن ئەم نووسینانە دەخوێننەوە و ئەم نیگارانە تەماشا دەکەن، خراپیان نەکەن، ئەگینا ئاهورامەزدا بەرەکەت لە ژیانیان دەبڕێت.

کەواتە، بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کوردستاندا نیگار و نووسین سیفەتێکی پیرۆزی پێ دراوە. ئەم پیرۆزییەش راستەوخۆ بە خواوەندەوە بەندە: ئەهورامەزدا نیگار و نووسینی خۆش دەوێ، بەهەمان شێوەش پاشا. نیگار و نووسین (هونەر) لای هەخامەنشییەکان دەگاتە ئاستی دین.

گرێدانی هونەر بە بەخت و چارەنووسی ئادەمیزادەوە؛

کەواتە، لێردوەیە کە بایەخی پەیام و رۆڵی هونەر، هەروەها بە کۆمەڵایەتی کردنی هونەر دەست پێ دەکات. جاران، راستە، هونەر هەبووە، بەڵام لای هەخامەنشییەکان، رۆشنبیری لەبارەی هونەر و مەعریفەی هونەر و فەلسەفەی هونەریش سەرهەڵدەدات.

## ژیانی سیاسی

### ٤٢٠ پ.ز

مێژوونووسی یۆنانی، هێرۆدۆت Herodote باسی میدیا، درەنگتریش سترابۆن Strabon و پۆلیبیۆس و تیتیۆس لیفیۆس باسی هەندێ لەو گرووپە ئەتنیکییانە دەکەن کە درەنگتر توخمەکانی نەتەوەیی کورد پێک دەهێنن: Cirtei و Cirti و Kyrtioi و گوردوێن کە پێشتر بە کاردۆخ ناسرابوو.

### ٤٠٠ ٤٠١ پ.ز

تێپەڕبوونی فەیلەسووف و سەرۆک لەشکر و ڕێبەری یۆنانستانی کۆن، ئێگزەنەفۆن Exenophon لەگەڵ دە هەزار سوارە یۆنانییەکە بە کوردستاندا. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا لە سەفەرنامەکەی خۆیدا ( ئاناباز Anabase )دا ناوی کورد بە Kardouque لەناو دۆکیومەنتی گریکەکاندا تۆمار دەکرێ. برێتییە لە گێڕانەوەی ئەو کارەساتە ناهەموارانەی کە خۆی و لەشکرەکەی لە کوردستاندا بەسەریان دێت و ئەو شەڕوشۆڕانەی لە وڵاتی کوردەکاندا ڕووبەڕوویان دەبنەوە.

ئێگزەنەفۆن دەڵێ: (کاردۆخ بەم شێوەیەی خوارەوە بەلەنگازی دوژمن دەبنەوە: زۆر لە ناکاو دێن و خۆیان دەخەنە ناو هێزەکانی دوژمنەوە، لە هەمان کاتدا لە پێشەوەشڕا ڕێگەیان لێ دەگرن، ئەمە پێش ئەوەی هێشتا دوژمن لە بڵندایییەکانیشەوە دەسەڵاتیان بەسەردا گیرابێ). ئەم تەکنیکەی شەڕکردنی کاردۆخەکان تەکنیکێکی بەرگریکارانەیە لە خاکی خۆیان نەک پەلاماردەرانە.

یۆنانییەکانی زەمانی دێرین، واتە گریکەکان Grecs، یەکەم کەسن هاتوونەتە کوردستان و بۆ یەکەم جار کتێبیان لەبارەی کورد و وڵاتی کوردەوە نووسیوە.

## ژیانی کولتووری

### ٤٠٠ ٤٠١ پ.ز

ئێگزەنەفۆن Exenophon کە دەگاتە ناو کاردۆخەکان Cardouques ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە چەکدارە یۆنانییەکان لە ڕێگەی وەرگێڕێکەوە قسەیان لەگەڵ کاردۆخەکان کردووە، دەڵێ: (ئێگزەنەفۆن زمانناسێکی لەگەڵ خۆی برد بۆ لایان، بۆ ئەوەی شەڕەکە ڕابگرێت و ئاشتی بەرقەرار ببێت..)

ئەم گەواهیدانەی ئێگزەنەفۆن چەند گریمانەیەکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە: کاردۆخەکان هەر لەو سەردەمەوە زمانێکی تایبەتی خۆیان هەبووە. زمانی کاردۆخییەکان زمانێکی تا ئەو ڕادەیە سەربەخۆ و بڵاو بووە کە لای بێگانە قسەی پێ بکرێ.

ئێگزەنەفۆن دەڵێ: (خانووچکەی کاردۆخەکان: ڕازاوە، پڕ بوون لە هەموو جۆرە قاپ و قاچاغێکی لە برۆنز دروستکراو). بەمە دەردەکەوێ کە کاردۆخەکان هەر لەو سەردەمەوە زانیویانە سوود لە میتاڵەکان وەربگرن.

ئێگزەنەفۆن دەڵێ: (کاردۆخەکان، بەسەر شاخەکانەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ هەر خەریکی ئاگرکردنەوە بوون). دیاردەی ئاگرکردنەوەی کاردۆخەکان پێوەندی بە ئاگرکردنەوەی نەورۆزی ئەمڕۆی کوردەوە هەیە و نیشانەی هاوڕەگەزیی کورد و کاردۆخەکانە.

ئێگزەنەفۆن دەڵێ: (پیاوە کاردۆخییەکە، کچێکی، شووی بە پیاوێکی خەڵکی ئەو ناوە کردووە). بەمە دەردەکەوێ کە ژنخوازی لای کاردۆخەکاندا تەنیا لەنێو یەک عەشیرەتدا نەبووە، بگرە سنوورێکی فراوانی هەبووە. ئەمەش پێشکەوتوویی کاردۆخەکانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

ئێگزەنەفۆن دەڵێ: (خانووی کاردۆخەکان پڕ بوون لە خواردەمەنی و بژێوی جۆراوجۆر، جۆرە شەرابێکی خۆشی ئەوتۆ لەناو ئەو خانووانەدا هەبوو کە یۆنانییەکان بۆ پاراستن خستیانە ناو چاڵە شەرابی چیمەنتۆیییەوە).

ئەم چاڵە چیمەنتۆ دروستکردنە لەلای کاردۆخەکانیشدا هەر هەبووە: نیشانەی هەبوونی

## کورد له پێش ئیسلامدا

پێش ئیسلام، کورد کە بەشێکی نەتەوەی ئێرانی پێک دەهێنا، بە خەتی سانسکریتی و پەهلەوی دەینووسی. کتاکانی زەردەشتیش بە زمانی میدیاییەکان هەر وا نووسراوە.

محەمەد تقی بهار لە سبکشناسی، ل ١٦ و ٣٨دا دەڵێ: کۆنترین بەڵگە لە زمان و خەتی پەهلەوییەوە مابێتەوە دوو قەواڵەی موڵکە لە مەڵبەندی وڵاتی کوردەواریدا. بە زمانی پەهلەوی لەسەر پێستی ئاسک نووسراوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٢٠ ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح. هەروەها لە هەمان جێگەدا دوو قەواڵەی تر دۆزراونەتەوە بە خەتی یۆنانی، کە ١٥٠ ساڵ پ. ز نووسراوە».

کولتووری کورد لە پێش سەرهەڵدانی ئیسلامدا بریتییە لە بەشێک کولتووری پەهلەوی و ئەشکانی و ساسانی و پاشانیش کولتووری ماد واتە میدیا (٥٥٠ پ. ز) و هەخامەنشی.

بەڵگەی نووسراوی کورد و ئەم ئیمپراتۆریەتە ناوبراوانە، هەموویان، لە دوای هێرشی ئەسکەندەری مەکەدۆنی کۆتاییان پێ هات.



ژیانێکی شارستانی کاردۆخەکان بووە.

ئێکزەنەفۆن ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پرسە بەستن بۆ شەهید و مردووان لای کاردۆخەکاندا نەریتێکی پیرۆز بووە، دەڵێ: (کاردۆخەکان تەرمی کوژراوەکانیان بەیەکتر سپاردەوە و قسەیان لەبارەی چۆنیەتی ڕێگەبڕینی داهاتوویان کرد، هەروەها دروودیان بۆ گیانی مردووەکان خوێند. چۆن کە لە ژیاندا ڕێز لە مرۆڤی هێژا و نرخمەند دەگیرێت ئاوها یادی ئەو مردووانەیان کردەوە).

ئێکزەنەفۆن ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کاردۆخەکان مۆسیقا و گۆرانیی تایبەتی خۆیان هەبووە و بە مەبەستی ورە بەرزکردنەوەی خۆیان بەکاریان هێناوە لە کاتی شەڕدا، دەڵێ: (کاردۆخەکان کاتێ دیتیان پاشەنگ لە لەشکرەکە دابڕاوە و ژمارەی چەکدارەکانیش یەکجار کەمە، یەکسەر کەوتنە چڕینی جۆرە گۆرانییەک).



برۆنزەکانی لوڕستان
لە سەردەمی میدیا



چیای نەمرود
ئاسەواری یۆنانییەکان




ئەگەر تۆ ئەم نووسین و نەخش و نیگارانەی ئێرە خەراپ نەکەیت و بیانپارێزیت، ئاهورامەزدا لە پشتت دەوەستێت و خێر و بەرەکەت دەخاتە ژیانتەوە...

دارێووش پاشا

کەلەکی شاخی بێستوون

ستوونی چوارەم

٣٣١ پ. ز - ٢٢٦ ز

## فەرمانڕەوایەتیی یۆنانییەکان لە کوردستاندا

## بۆ ماوەی نزیکەی ٥٥٧ ساڵ

ئەسکەندەری مەکدۆنی Aleexandre (٣٥٦ ـ ٣٢٣ پ. ز) لە رۆژئاواوە دێت مێزۆپۆتامیا و ئێرانی ئەمڕۆ داگیر دەکات: لە شەڕی Arbeles (لە گۆگامێل، نزیک شاری هەولێری ئەمڕۆ) لەشکری داریۆش پاشای هەخامەنشییەکان تێک دەشکێنێ، کوردستان دەکەوێتە ژێر دەستی یۆنانییەکان.

کوردستان، بەم شێوەیە، تا ساڵی (٢٢٦ م.) لەژێر کاریگەریەتیی زمان و کولتوور و سیاسەتی یۆنانییەکاندا دەمێنێتەوە؛ واتە نەتەوەی کورد بۆ ماوەی نزیکەی (٥٥٧) ساڵ لەژێر کاریگەریەتیی کولتوور و زمان و دەسەڵاتی یۆنانییەکاندا دەژیت.

ئەسکەندەری گەورە وای کرد سەرنجی هەموو دنیا بۆ کوردستان رابکێشێ و ناوی «هەولێر» لە ئەنجامی شەڕی ئەربێلا Arbella بکەوێتە ناو تابلۆکانیان و بەڵگەنامە هونەری و مێژووییەکانی ئەوروپاوە: بناخەیەکی پتەوی بۆ ناساندنی رۆهەڵات و کوردستان دامەزراند.

ئەم شەڕە یەکەم سەرکەوتنی ئەوروپایە بەسەر رۆهەڵاتدا، گرنگترین و دیارترین یەکانگیربوونەوەی رۆژئاوا و رۆهەڵاتە لە مێژوودا.

٣١٢-٢٤٧ پ. ز

بنەماڵەی سێلوجییەکان Seleucides کە بنەماڵەیەکی گریک (یۆنانی کۆن) بوون دەبنە فەرمانڕەوای مێزۆپۆتامیا و ئێرانی ئەمڕۆ. لە کۆتاییدا، شەڕ دەکەوێتە نێوان فەرمانڕەوا و سێلوجیە- یۆنانییەکان لەسەر دەسەڵات.

٥٣ ٢٠ پ. ز

کوردستان هەر لەژێر دەسەڵاتی یۆنانییەکاندایە: شەڕ و شەڕوشۆڕی بەردەوام لە نێوان یۆنانییەکان و دەوڵەتی پارث Parthe.



٣٣١ پ. ز - ٢٢٦ ز

## فەرمانڕەوایەتیی یۆنانییەکان لە کوردستاندا

## بۆ ماوەی نزیکەی ٥٥٧ ساڵ

لە ٣٣١ پ. ز. بەملاوە، واتە لەو کاتەوەی ئەسکەندەری مەکدۆنی لە شەڕی ئەربێلا لە هەولێر داریووش پاشای هەخامەنشی (ئەخمینی) دەشکێنێ، کوردستان لەژێر دەسەڵاتی یۆنانییەکاندا لە کولتووری یۆنانی ئاو دەخواتەوە. زمان و کولتوور و تەنانەت فیزیک و هونەریشمان دەکەونە بەر زەبری زمان و دین و فیزیک و کولتووری یۆنانییەوە. یۆنانییەکان بەشێک لە پەرستگا زەردەشتییەکان تێک دەشکێنن، کولتووری خۆیان دەسەپێننە سەر کوردستان.

- ئەسکەندەر نووسینی خستە سەر خەت و زمانی یۆنانی. هەندێک نووسراوی کەم نەبێ ماونەتەوە: وەک نەخشی سەر دیوارەکانی بێستوون و پەیکۆڵی...

یەکێک لە سەرنجراکێشترین شوێنەوار کڵێسای شاری (ئورفە)یە کە (ئیدیسا) عەرەبەکانیش پێی دەڵێن (رەها). مێژووی ئەو کڵێسایە کە بە مۆزاییک و بەردی وێنە لەسەر کێشراو، دروست کراوە، دەبەنەوە سەر (٢٠٠) ساڵ پ. ز. و دەڵێن کە مزگەوتی الاقصی لە بیت المقدس لەسەر شێوازی ئەوێ دروست کراوە. حمدالله المستوفي ل ١٦٦ و یاقوت الحموي ٢، ل ٢٣١ باسی دەکەن.


داریووش پاشا

### ۸۸ و ۲۲ و ۱۲ پ. ز

## پێکهاتنی توخمەکانی زمانی کوردیی ئەمڕۆ

نووسینی سێ بەڵگەنامە لەبارەی کڕین و فرۆشتن لە هەورامان بە زمانێک کە زۆر نزیکە لە زمانی ئەمڕۆی کوردی. ئەمە مانای وایە کە لەو سەردەمەوە خەریکە توخمەکانی پێکهاتنی زمانی ئەمڕۆ سەرهەڵدەدەن:

- بەڵگەنامەی یەکەمی هەورامان بە ئەلفابێی نارامییە کە لە پەهلەوییەوە وەرگیرابوو و تەنانەت دوای مەسیحیش بەکار دەهات، (۳۰) وشەی کوردیی ئەمڕۆی تێدایە لە ساڵی (۱۱ - ۱۲ پ. ز) نووسراوە.
- بەڵگەنامەی دووەمی هەورامان بە ئەلفابێی یۆنانی بووە، لە ساڵی (۸۸ پ. م) نووسراوە.

بەڵگەنامەی سێیەمیش هەر بە ئەلفابێی یۆنانییە، لە ساڵی (۲۲ پ. ز) نووسراوە.

هەرسێکیان بە زمانێک نووسراون کە پرۆفیسۆری ئینگلیز. مینس، کە پسپۆڕی ئەو بەستێنەیە، دەڵێ: ئەم زمانە، لەم پارچە نووسراوانەدا زمانی کوردیی کۆنە». هەرسێکیشیان لەژێر کاریگەریەتیی زمانی ئارامی و یۆنانیدان.

د. جەمال ڕەشید: لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی لەبارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری

# لەدایکبوونی مەسیح

# و

# چاخی مەسیحییەت



ئەسکەندەر لە شەڕی "ئەربێللا" داریووش پاشا بریندار ددکا

(تابلۆیەکی سیرامیکی یۆنانیی کۆن)

## لەدایکبوونی مەسیح

## و

## چاخی مەسیحییەت

- سەرتاپای کوردستان هەر لەژێر دەسەڵاتی یۆنانییەکاندایە.

**١- ٢٢٥ زاینی**

- سەرتاپای کوردستان هەر لەژێر دەسەڵاتی یۆنانییەکاندایە.

- لەو سەردەمەدا کە سەرتاپای کوردستان لەژێر دەسەڵاتی یۆنانییەکاندایە، بەشێکی کوردستان جوولەکە بووە، بەشەکەی تر زەردەشتی بووە، بەشێکی تریش باوەڕی بە مەسیح هێناوە.

نزیکەی پێنج سەد ساڵێک، کوردستان لەژێر دەسەڵات و کاریگەریەتی کولتووری یۆنانییەکاندا بوو. پەیکەر و شوێنەوارەکانی ئەو کاریگەرییە چیای نەمروود جوانترین یادگارییەکانی ئەم تەئسیردیە بەسەر هونەری پەیکەرتاشی لە کوردستاندا.



ئاشتەوایی یۆنانی و کورد
چیای "نەمروود"



## لەدایکبوونی مەسیح

## و

## چاخی مەسیحییەت

تەورات و ئینجیل ناوی کورد و کوردستانیان بەشێوەیەکی راستەوخۆ نەهێناوە و هیچیان لەبارەی ڕەگەزمان نەدرکاندووە، بکرە تەنیا ناوی هەندێ لە میرنشین و شار و شاخ و شا و رووبار و مەڵبەندەکانی کوردستانیان هێناوە (وەکو ئارارات، جوودی، نووح، میدیا...) چەند چیرۆکێکیان لەم بارەوە بۆ گێڕاوینەتەوە.

**تەمووزی ١٥٤ زاینی**

بن دەیسان (ابن دیصان) لە دایک و باوکێکی کورد، لە شاری (ڕەها/ ئورفە)ی کوردستانی تورکیا لەدایک بووە، یەکەم جار زەردەشتی پاشان بووەتە مەسیحی، ئنجا ویستوویەتی هەردوو دین لەیەکتر گرێ بدا.. مێژوونووس، ئەستێرەناس، نووسەرێکی ئیشراقی و بیرمەندێک بووە: هاتووە بە زمانی سریانی -چونکە ئەو کاتە نووسین و زمانی زانست لە کوردستان و لە ناوچەکەدا بە زمانی سریانی و یۆنانی بووە - مێژووی پێنجسەد ساڵی ڕابردووی شارەکەی خۆی (واتە مێژووی پێنجسەد ساڵی پێش ١٥٤ی زاینیی) نووسیوەتەوە. کتێبەکانی، لە سریانییەوە کراونەتە ئینگلیزی و فەڕەنسی. شەهردستانی (کە لە ١١٥٣ مردووە) باسی کردووە.

علینقی منزوی لە وتارێکیدا کە (زەبیحی) لە سەرەتای پایزی ١٩٧٣ لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا تەرجەمە و بڵاوی کردووەتەوە، لەباردی بیری (بن دەیسان)دوە دەڵێ:

«یەکتاناسیی ئیشراقیی سۆفییەکانی کوردستانی پاش ئیسلام، هەمان تیۆرییەکانی (بن دەیسان)ە و کامڵتر.

- لە سەرهەڵدانی مەسیحییەتەوە زۆربەی نووسین لە کوردستاندا بە ئەلفابێی سریانی و بە زمانی سریانی بوود.

٢٢٦   ٦٥١ ز.

## دەسەڵاتی ساسانییەکان

ساسانییەکان، کە بنەماڵەیەکی فارس بوون، لەژێر فەرمانڕەوای (ئەردەشێر) دا دەسەڵات بەسەر ئێران و سەرتاپای کوردستاندا دەگرن، وێڕای دیانەتی مانێ Mane **چوار سەدە لە کوردستاندا** بەردەوام دەبن. یۆنانییەکان **دەسەڵاتیان لە کوردستاندا** کۆتایی پێ دێ.

### ٢٤١ ز.

**ساسانییەکان لە کوردستاندا دەسەڵاتدارن: لە سەردەمی شا شاپووری یەکەمی ساسانی ٢٤١ ـ ٢٧٢، ئەسقەفێک بە** ناوی شەحلۆفا، ئەسقەفی هەولێر بووە، هەوڵی داوە بۆ ڕێکخستنی ژیانی مەسیحییەکانی هەولێر و مەڵبەندی حەدیاب. لە سەردەمی بارامی سێیەمدا ( ٢٧٦ ـ ٢٩٣) کاهینێکی بۆیان داناوە.

### ٣١٠ ز.

شاپووری دووەم پاشای ساسانی باوەش بۆ مەسیحییەت دەکاتەوە لە وڵاتدا.

– لەگەڵ پەیدابوونی مەسیحییەت، لە سەردەمی ساسانیدا، بەرهەڵستکارییەک لەلایەن مووگەکانی زەردەشتی دژی کڵێسا بەرپا دەبێ. هەزاران کورد لە کەرکووک شەهید کران، چونکە دەستیان لە زەردەشتی هەڵگرتبوو کە ئاینی باپیرانیان بوو.

### ٣٤٤ ز.

کوژرانی مار یۆحەننا کە سەرۆکی قەشەکانی هەولێر بوو بە دەستی پیاوێکی زەردەشتی بە ناوی (پیرۆز تەمشاپوور). ئەمە مانای وایە دینی زەردەشتی لە کوردستاندا تا ئەو کاتە بەردەوام هەبووە و ناکۆکیی لەگەڵ مەسیحییەتدا هەبووە.

### ٣٦٤ ز.

ئاسک و ڕاهیبە مەسیحییەکانی ڕۆئاوا لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی زاینەوە (٣٦٤ ـ ٣٧٨) هاتوونەتە



٢٢٦ - ٦٥١ ز.

## دەسەڵاتی ساسانییەکان

ساسانییەکان لە ساڵی ٢٢٦ی زایینیدا حوکم دەگرنە دەست و یۆنانییەکان دەردەکەن؛ فەرمانڕەواییەتیی کوردستان و بەشێک لە ڕۆهەڵاتی ناوەڕاست دەگرنە دەست؛ دینی خەڵک لەو سەردەمەی ساسانییەکاندا زەردەشتی و مەسیحی و مانایی و جوولەکە بوو.

– نیگارکێشی ئێرانی، مانی (٢١٥-٢٧٤ ) کە لە سەردەمی ساسانییەکان ژیاوە، بە یەکێک لە یەکەمین نیگارکێشە میناتۆریستە ناودارەکانی ڕۆهەڵات دەژمێردرێ. دینی (مانی)یشی بڵاو کردووەتەوە لە کوردستاندا.

هونەری سەردەمی ساسانییەکان بەوە دەناسرێتەوە کە بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا نیگارکێش لەسەر کەرەستەی تری غەیری دار و بەرد و دیوار ڕەسم دەکات، واتە هەوڵ دەدات تابلۆی سەربەخۆ ڕەسم بکا. لەم بارەوە حوسێن حوزنی موکریانی دەڵێ: «لە عەسری پێش ئیسلامدا کوردەکان خانوویەکی تاریکیان دروست دەکرد و کونێکی چکۆڵەیان تێدا دەهێشتەوە، پیاوێکی عەکسیان وەرگرتبایە، لەبەر ئەو کونەیان دوور ڕادەگرت. ڕەسسام لە ڕۆژی ئەو خانووەدا ڕەسمی دەخستە سەر چتێکی مەطلوب و بە قەڵەم خەریکی دەبوو».

مێژوونووسە موسڵمانەکانی (سەدەی ٩ – ١٢ز.) باسی ئەوە دەکەن کە هونەرمەندەکان دەسنووسەکانیان بە نەخش و نیگار دەرازاندەوە و لە پەرستگا زەردەشتییەکاندا دەیانشاردنەوە.

قۆناغی پێش بڵاوبوونەوەی ئیسلام (لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەکانی میدیا و ساسانی و ئاشوورییەکاندا، قۆناغێکی پڕشنگداری هونەر دەنوێنێ لە شارستانییەتی کوردستاندا: پەیکەر و نەخش و نیگارەکانی لوڕستان، ئەمروود، دیاربەکر، هەمەدان، مەهاباد، تاقی بێستوون، خری کەلالی، کێلەکانی قەندیل، قەڵای دیاربەکر و هەولێر.. یادگاری پێش بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلامن.

## ژیانی سیاسی

ـەلبەندی میزۆپۆتامیا، بەتایبەتیش لە کوردستاندا بلاوبوونەتەوە: لە ناوچەکانی باشووری مووسڵ و دهۆک و هەولێر و هەکاری و دیاربەکر و نوسەیبین.

لە سەردەمی ساسانییەکان سکە و دراوی جۆراوجۆر لە کوردستان بەکار هاتووە، ئەمەش چونکە لە سەردەمی ساسانییەکاندا بەشی ڕۆژاوای کوردستان لەدەست ڕۆمییەکان (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بووە.

سەعید نەفیسی لە (مێژووی شارستانیەتی ئێرانی)، ل ٦٥٦، دەڵێ کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا پارەی ئێرانی بە برەوترین و باوەڕپێکراوترین پارە بووە،



هونەری کوردستان
لە سەردەمی ساسانییەکان دا

## ژیانی کولتووری

زۆربەی مێژوونووسەکان لەوەدا یەک دەگرنەوە کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا، بۆ یەکەمین جار تابلۆ (نیگاری سەربەخۆ) بەتایبەتی مینیاتۆری ناو دەستنووس و کتێبان، سەر هەڵدەدات.

د. جەمال نەبەز ئاماژەی ئەوە دەکا کە پێش هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان، بەشێک لە نووسینە کوردییەکان بە خەتی سریانی بوونە، بەشێکی کەمتریش بە خەتی ئەرمەنی بوونە.

### ٢٧٤

لە سەردەمی ساسانییەکان (٢٧٤ز) ناوی میرێکی یەزیدی هاتووە. میشێل شوڤالیێ دەڵێ کە لە سەدەی ١٣ یەزیدی ئاینی زۆربەی کوردەکان بووە.

لە بەندی (٥٢)ی (مەسحەفا ڕەش) هاتووە: «پێش هاتنی عیسا، ئاینی ئێمە ناوی بتپەرستی بوو، جوولەکە و مەسیحی و موسڵمان هەموو کات دوژمنی ئێمە بوون».

– تۆما بوا، کوردناسی فەڕەنسی، دەڵێ: لە سەردەمی ساسانییەکاندا کورد مووزیکی یەکجار بەرزیان هەبووە، تەنانەت کاری کردۆتە سەر درواسێکانیشی. لە چەنگ ژەنیندا ناودار بوون، زۆر ئاوازیان هەبووە.

### ٣١٦

مەسیحییەت یەکەم جار لە ناوچەی حەدیاب (هەولێری ئەمڕۆ) بڵاو بووەتەوە. هەولێر تا ساڵی ٣١٦ ز. سێزدە ئەسقەفی هەبووە؛ یەکێک بووە لەو شەش بنکە گرینگەی مەسیحییەتی لێوە بڵاو کراوەتەوە.

### ٤٠٠

ئەتلەس و پەردە و چنراو و فەرشەکانی کوردستانی ئێرانی ئەو کات لە ناوەخۆ و دەرەوەی وڵات خوازیاری زۆری هەبوو لە سەدەکانی چوار و پێنجی زایندا.

فەرش و بەڕە و هەموو جۆرە کردێکی خوری وەک جاجم و پەردەی جۆراوجۆر تایبەتی کوردستان بوون و ئەو ناوچانە پیشەسازیی گرینگی سەردەمی ساسانییەکان بووە. – مروج الذهب. ب ١. ل ٢٥٤.



برۆنزەکانی لورستان
لە سەردەمی میدیا

## ٥٥٠

کوردستان هەر لەژێر دەسەڵاتی ساسانییەکاندایە (کاتی فەرمانڕەوایەتیی خوسرەوی یەکەم نەوشیروان).

## ٥٧٠

لەدایکبوونی محەمەد(د.خ)، پێغەمبەری موسڵمانان

## ساڵانی ٥٩٠

لایشوعیاب حەدیابی لە کۆتاییی سەدەی شەشەم لەدایکبووە، لە هەولێر ژیاوە. لە نوسەیبین خوێندوویەتی. ڕێبەرێکی دینی مەسیحی بووە لە هەولێری کۆتاییی سەدەی شەشەمدا.



م. ت. کاولی لە (مێژووی دیاربەکر) کە لە ١٩٥٦ چاپ کراوە بەتورکی، دەڵێ کە لە نامەد لە سەدەی پێنجەمی زاینیدا، ٢٧ کارگەی چنین و ٣١ کارگەی دروستکردنی فەرش هەبووە. - ل ٣٨

## ٤٨٠

درەوشانەوەی ناوی دوو پەیکەرتاشی ئەو سەردەمە: (شاپوور) و (فەرهاد)، نەخشەکانی تاقوەسان بەقەد پاڵی شاخی بێستوونەوە لە کرماشان، یادگاری زەمانی ساسانییەکانن.

نەخش و نیگار و پەیکەرە هەڵکۆڵدراوەکانی سەر شاخی بێستوون کاریگەریەتی هونەری گریک - بێزەنتی و ڕۆمانیان بەسەرەوە دیارە. جگە لە ئاسەوارەکانی قەسری شیرین و بەختیاری و تاقی کیسرا هەروەها پەیکوڵی (لە سلێمانی)، کە لە سەردەمی خوسرەوی دووەمدا دروست کراون، کۆمەڵە یادگارێکی دیاری تری سەردەمی ساسانییەکانن. (تاقی کیسرای دروستکراوی خوسرەوی دووەم لە ساڵی ٦٣٧ بەولاوە لەلایەن دەسەڵاتی ئیسلامەوە کرایە مزگەوت).

ساسانییەکان ئەگەرچی بەردیشیان بۆ داتاشین و پەیکەرتاشی و ڕەسم بەکار دەهێنا، بەڵام زیاتر بایەخیان دەدایە بەکارهێنانی گەچ، کە دواتر ئەمەوی و عەبباسییەکان سوودیان لەم شێواز و تەکنیکەیان وەرگرت بۆ بنیاتنانی کۆشک و مزگەوتەکانیان.

- مازیار کۆرانیبێژ و گاڵتەجارێکی خەڵکی هەولێر بووە لە سەردەمی خوسرەو پەروێزی پاشای ساسانییەکان.

## ٥٥٠

لە سەردەمی ساسانییەکاندا کتێبی (کرۆنۆژیای ئەربێللا) بە پێنووسی (مشیحا زیخا)ی قەشەی هەولێری، بە زمانی سریانی Syryaque دەنووسرێ: باسی ئەوە دەکا کە بەشێکی کوردستان و زۆربەی ناوچەکانی هەولێر، جگە لە زەردەشتی و جوولەکە، مەسیحی بوونە. ئەم کتێبە قۆناخەکانی بڵاوبوونەوەی دینی مەسیحییەتمان بۆ ڕووناک

صافی دەڵێ:

کەسێ بەم عەصرە نەیدیوە بەشەر وەک تۆ بە شیرینی
تەحەیوور ما لە تەصویرت نەکەر نەققاش نەکەر مانی



دەکاتەوە لە کوردستاندا. ئاخۆ ئەم کتێبە سریانییە دەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە لە ساڵی (٥٥٠ م) نووسین لە کوردستان یان بەلای کەمەوە لە هەولێر، بە زمانی سریانی یان بە ئەلفابێی سریانی بووە؟

ئەتەوەی کورد لە سەدەکانی پێش بە ئیسلامبوونی خۆیدا، واتە پێش ساڵانی (٦٢٤- ٦٣٤ ز)، بە ئەلفابێی سانسکریتی و پەهلەوی و سریانی و ئەرمەنی و هی تر دەینووسی.



نەخشەی دەسەڵاتی میدیا



شەڕی ئەربێللا

هونەرمەندێکی ئەڵمانی لە ساڵانی ١٥٠٠

لە مۆزەخانەی میوونخ پارێزراوە.

# داگیرکرانی کوردستان

# لەلایەن ئیسلامەوە

# ٦٣٤



## داگیرکرانی کوردستان

## لەلایەن ئیسلامەوە

## ٦٣٤

### ٦٣٤- ٦٤٤

سەرەتای هێرشی موسڵمانە عەرەبەکان بۆ بڵاوکردنەوەی دینی ئیسلامی لە کوردستاندا:

عومەری کوڕی خەتاب لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا (٦٣٤- ٦٤٤) دەست دەکاتە فتووحات لە کوردستاندا. بە ئیسلامکردنی کورد، بەم شێوەی خوارەوە دەست پێ دەکات:

- هێزی یەکەم بە سەرکردایەتیی سوهەیای کوڕی عودەی، بەرەو ناوچەی ئورفە.
- هێزی دووەم بە سەرکردایەتیی (عبدالله ابن عتبان) بەرەو ناوچەی نوسەیبین.
- هێزی سێیەم بە سەرکردایەتیی عوقەبەی کوڕی وەلید، بەرەو ناوچەی جەزیرە و بۆتان.

هەرسێ هێزیش بە سەرکردایەتیی عەیازی کوڕی غەنمی بوو کە لە سەرەتادا بۆ ماوەی مانگێک بەرەنگاری و بەردبارانی لەشکری ئیسلامیان کرد و پاشان دوای کوشتارێکی زۆر خۆیان بەدەستەوە دا.

### ٦٣٦ ز.

(سەعد ابن وقاص) بە فەرمانی (عمر ابن خطاب) لە شەڕی (القادسية) دەوڵەتی ساسانییەکانی تێک شکاند. ئنجا لە ٦٣٧ شاری جەلەولای (دوای ٨ ڕۆژ بەرگری و شەڕی خوێناوی) داگیر کرد.. پاشان لەشکری ئیسلام گەیشتنە شاری مەندەلی و داقووق: ئەوانیشیان بە شەڕ کردە ئیسلام.

### ٦٣٧

سوپای ئیسلام بە سەرکردایەتیی (عبدالله ابن معتوم) مووسڵیشی داگیر کرد. (ابن الاثیر) (الکامل ٢/ل٥٢٤) دەڵێ: لەو شەڕ و تاڵان و سەرکەوتنەی موسڵمانەکان بەسەر مووسڵدا هەر سەربازێکی عەرەبی موسڵمان سێ هەزار درهەمی بەرکەوت.



## داگیرکرانی کوردستان

## لەلایەن ئیسلامەوە

## ٦٣٤

«لە پاش دەرکەوتنی ئیسلامیەت، ئەکسەری کتێبی دینی کورد و ئاڤێستایی سووتێنرا. پیتی کوردەواری گۆڕا و کەلیماتی بێگانە تێکەڵاو بە زمانەکەمان بوو. حەماسەتی ئەم دینە تازەیە تەنریخی سەقافەتی کوردی نەهێشت..»

ڕەشید نەجیب

(ژیان)، سلێمانی: ١٩٢٨

- لە دوای لەدایکبوونی مەسیحەوە تا دوای خەلافەتی ئەمەوییەکانیش (ساڵانی ١٠٠ تا ٩٠٠ی مەسیحی) بە تاریکترین سەردەمی زانیارییەکانمان دەژمێردرێت لەبارەی ژیان و مێژووی نەتەوەییمان: بەڵگەنامە و نووسراوێکی ئەوتۆ لەبارەی وڵاتەکەمان بەردەست ناکەون. ئەمە لەوانەیە هیی ئەوە بێ کە لەم ماوەیەدا، بەپێی قۆناخ، تەنیا دوو مێتۆدی نووسینەوەی مێژوو زاڵ بووە: یەکەم: دیدی مەسیحییانە بۆ نووسینەوەی مێژووی دنیا، دووەم: دیدی ئیسلامییانە؛ ئیتر کوردیش - سەبارەت بەوەی هیچیان نەبووە بەتەواوەتی- بۆیە خراوەتە دەرەوەی بازنەکانیانەوە یانیش سووتێنراون.

### ٤٨٤ - ٦٥٠ ز

بارودۆخ و ڕووداوەکانی نێوان ساڵانی (٤٨٤ - ٦٥٠ ز) واتە ڕووداوەکانی کاتی داگیرکرانی کوردستان لەلایەن ئیسلامەوە، تەنیا لە تاقە دەسنووسێکی دانسقەدا باس کراون بە زمانی ئاشووری (سریانی Syriaque) کە لە شاری (سیرت Seert ) یان (سعرت)ی کوردستانی تورکیادا پارێزراون. ئەم ڕاستییەش لەم سەرچاوەیەدا، بە زمانی فەرەنسی، باسی لێ کراوە:

Catalogue des maunscrits Syriaques et arabes et arabes consacrea dans la Bibliotheque episcopale de Seert. avec notes bibliographiques. Moussul: 1905. N. 128-2.

بە کوردییەکەی دەبێتە (کەتەلۆگی ئەو دەسنووسە

## ژیانی سیاسی

### ٦٣٨ - ٦٣٩

سوپای ئیسلام لەژێر سەرکردایەتیی عوتبەی کوڕی فەرقەد
-کرێ و هەولێر و شێخان و زێبار و دهۆک و زاخۆیان،
پاش بەرگرییەکی سەختی دانیشتووانی شارەکان، کردە
ئیسلام.. لە کۆتاییشدا کەرکووک.

لەشکری ئیسلام ناوچە چیاییەکانی میدیایان وردە وردە و بەناڕەحەتی گرتووە، ئەمەش تەنیا لەبەر سەختیی شوێنەکە نەبوو، بگرە بەهۆی بەرهەڵستیی توندوتیژی دانیشتووانەکەیەوە بوو.

### ٦٤١

ناوچەی شارەزوور بەرەنگاریی کوشتارێکی بێ وێنەی ئیسلامەکان (بەسەرکردایەتیی عومەری کوڕی عەزەی کوڕی قەیس) دەکات: نایەوێ ببێتە ئیسلام. پاشان لەشکری ئیسلام شاڵاوێکی تری دەکاتە سەر بە سەرکردایەتیی عوتبەی کوڕی فەرقەد، لە ئەنجامدا شارەزوور دوای بەرگری و قوربانییەکی بێ هاوتا، خۆی بەدەستەوە دەدات و دەبێتە موسڵمان.

### ٦٤٢

دوایین شەڕی بەرگریکاریی ساسانییەکان، شەڕی نەهاوەند، دژ بە موسڵمانە عەرەبەکان.

### ٦٤٣-٦٤٤

شاری دیاربەکر و ماردین و ئەرزن، پاش ڕێککەوتن لەگەڵ دانیشتووانی شارەکان و سەپاندنی باجی جزیە بەسەریاندا بە خەلافەتی ڕاشدیی ئیسلامەوە گرێ دران.

### ٦٤٤-٦٤٥

لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفانی سێیەمین خەلیفەی ڕاشدی، دەسەڵاتی ئیسلام ناوچەی جەزیرە و بۆتانی تەعریب کرد و هۆزەکانی ڕابە و قەیس و ئەسەدی هێنانە ئەوێ. (البلاذري: فتوح البلدان/١/٢١١ و ٢١٩).

- لە ٦٤٥ ناوچەی موکریان دژ بە دەسەڵاتی وەلیدی

## ژیانی کولتووری

سریانی و عەرەبییە کۆنانەی کە لە کتێبخانەی سیرت داندراون، تێبینی بەند کراون. مووسڵ: ١٩٠٥، ژمارە: ٢-١٢٨).

واتە: لە کتێبخانەی مووسڵ کەتەلۆگێک هەیە ئاماژەی بەوە داوە کە کۆمەڵە دەسنووسێکی سریانی، بە زمان و ئەلفابێی سریانی، لە کتێبخانەی (سیرت) هەن باسی کوردستانی ساڵانی (٤٨٤ - ٦٥٠ ز) دەکەن.

هەروەها ئەم سەرچاوەیەش، هەمان ڕاستی دووپات دەکاتەوە:

Notice sur les manuscripts Syriaques et arabes de l Archeveque Chaldeen de Diarbekir. in (Journal Asiatique. Sept.-Oct. 1907. P. 409).

کۆواری (ژورناڵ ئازیاتیک، کە لە مانگی سێپتەمبەر و ئۆکتۆبەری ١٩٠٧ لە پاریس بڵاو کراوەتەوە، ئاماژەی بەمە داوە کە کۆمەڵە دەسنووسێکی سریانی، لە کتێبخانەی کلدانییەکانی (دیاربەکر) هەن، بە زمان و ئەلفابێی سریانی، باس لە کوردستانی ساڵانی (٤٨٤ - ٦٥٠ ز) دەکەن.

ئەم دوو دەسنووسانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە لەو ساڵانەدا نووسینی کوردان لە مەڵبەندەکانی کوردستاندا بە زمانی سریانی بووە. ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام لە کوردستاندا، نووسین و خوێندنەوە و ئەلفابێی نووسین لە ناوچەکانی کوردستانی عێراق و تورکیادا بە زمان و ئەلفابێی سریانی (ئاشووری Syriaque) بووە. ئەمە جگە لەوەی کە لەو مەڵبەندە ناوبراوانەدا، لە کاتی سەرەتای بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلامدا ئاشووری و کلدانی (ژاکۆبی و نەستۆری) ژیاون.

ئەم تێبینی و زانیارییانەم لەم سەرچاوەیەوە دەست کەوتووە، کە کلیلەکەی لە کتێبخانەی لانگزۆ لە پاریس ئەمەیە « CDP .20 »:

Addai SCHER: Histoire Nestorien. Chronique de Seert. Archeveque Chaldeen de Kurdistan. Paris: Juin: 1909.

نووسین بە زمانی سریانی (ئاشووری Syriaque) و بە

## ژیانی سیاسی

کوڕی عوقبەی تەبی موعیط ڕاپەڕین و چەند هێرشێکی سەختیان کردە سەر سوپای موسڵمان: بەڵام سەرکوتکرانەوە. (ابن الاثیر: الکامل/٣/٨٣).

### ٦٤٩ ـ ٦٥٠

لە سەردەمی خەلیفایەتیی عوسماندا ڕاپەڕینێکی گەورەی کورد هەڵگیرساوە. فەرمانڕەوای شاری بەسرا بانگەشەی جیهادی بۆ کپکردنەوەی ئەم ڕاپەڕینە کردووە.

### ٦٥١

ئیمپراتۆری ساسانیی فارس بەتەواوەتی تێک شکا. ئێران و سەرتاپای کوردستان کەوتە ژێر دەستی عەرەبە موسلمانەکان.



لالش

پەرستگای یەزیدیەکان

## ژیانی کولتووری

ئەلفابێی سریانی لە یەکەمین سەدەکانی زایینیدا واتە لە ماوەی ساڵانی لەدایکبوونی حەزرەتی مەسیحەوە تا ساڵانی (٦٠٠)، کریمانەیەکی هێند بەهێزە و هێندە لە ڕاستی دەچێ، کە من بەتەواوەتی باوەڕم پێی هەیە وا بووبێت. جگە لەم بەڵگانەی سەرەوە، بەڵگەیەکی تریش بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە دەهێنمەوە، ئەویش کتێبە ناودارەکەی مێژوونووسی موسڵمان (الفارقي)یە، احمد بن یوسف الارزق الفارقي (١١١٧- ١١٨١)، کە بە بنەچە کوردی دیاربەکرییە و لە (١١٧٦ ز) کتێبی (تاریخ الفارقي)ی نووسیوە کە بریتییە لە مێژووی دەوڵەتی دۆستەکی کە پایتەختیان لە (میافارقین)ی نێزیک دیاربەکر بووە و عەرەب پێی دەڵێن (الدولة المروانیـة) و تەمەنی دەوڵەتەکەش (١٠٤) ساڵ بوود. کتێبەکەی (احمد بن یوسف الارزق الفارقي) (تاریخ الفارقي، تحقیق و تقدیم: د. بدوي عوض، القاهرة: ١٩٥٩) کراوەتە کوردیش (مێژووی میافارقین و ئامەد، وەرگێڕانی: د. قادر محەمەد پشدەری و ئاکۆ بورهان، دەزگای وەرگێڕان، هەولێر: ٢٠٠٧). لەو کتێبە ناوبراوەی (الفارقي)دا، نووسەر ئاماژەی بەمە داوە کە زانیارییەکانی نێو ئەو کتێبە نووسراوەی خۆی لە پەڕتووکێکی سریانی وەرگرتووە بە ناونیشانی (التشعیث) کە لە پەرستگای مەسیحیی شایانەی شاری میافارقین پارێزراو بووە و (الفارقي) بەهاوکاریی یەکێک لە قەشەکانی ئەو پەرستگایە لە زمانی سریانییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.

ئەم بەڵگەیەش دیسان ئەوە دەسەلمێنێ کە لەو زەمانەدا لەو ناوچە دیارکراوانەدا نووسین بە زمانی سریانی ڕەواجی هەبووە و مێژوونووسەکان، نەک هەر زمانی سریانییان زانیوە، بگرە پشتیشیان پێ بەستووە و بۆ نووسینی کتێب - وەک (الفارقي) باسی دەکا- تەرجەمەیشیان کردووە.

٦٥١

سەرهەڵدانی تێکستێکی نووسراو، پارچە چەرمێکە لە شارەزوور دۆزراوەتەوە بە زمان و خەتی پەهلەوی کە لە زمانی کوردیی ئەمڕۆوە زۆر نزیکە، باس لە هێرشی موسڵمانە عارەبەکان دەکات بۆ سەر ئاتەشگەدەی کوردەکان کە دینی زەردەشتییان هەبووە.

ملک الشعراء ی فارس ( بهار) لە ١٣١٦ی هەتاویدا لە کۆواری هەتاو بڵاوی کردۆتەوە. هەروەها ڕەشد یاسەمی: کورد و پێوەندییە ڕەگەزییەکانی، ل ١١١، لەگەڵ ح. ح. موکریانیش لە (کوردستانی موکریان) لە ل ٣٤ و ١٣٣ باسیان کردووە:

هورمزگان رەمان، ئاتیران کوژران
وێشان شاردەوە گەفرە گەفرەکان
زوکرنە عەرەب کوردی نە خاپوور
گەنانە پالە مەش شارەزوور
ژن و کەنیکان وە دیل پەشینان
مەرد ئازا، تلین ژروی هەوی نان
رەوشی زەردوشت مایەوە بی دەس
بەزیکا ناکا هورمز وە هیچ کەس

واتە:

هورمزدگە وێران کرا، ئاگرەکان کوژێندرانەوە، گەورەی گەوران خۆی شاردەوە، عەرەبی زۆردار گوندەکانی تا شارەزوور وێران کرد، ژن و کیژ بە دیل گیران، ئازاکان لە خوێنی خۆیان گەوزین، دینی زەردەشت بێ خاوەن مایەوە، ئاهورامەزدا ڕەحم بە کەس ناکا».



سینییەکی ساسانی
لە کوردستان دۆزراوەتەوە

کاتێ ئیسلام هات، زمانی عەرەبی و کولتووری ئیسلامی بەسەر هەموو نەتەوەیەکدا فەرز کرد و «هەموو میللەتانی یەکسان کرد»: «و جعلناکم شعوبا و قبائل لتتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم».

ئەم یەکخەتی و یەککولتووری و یەکزمانییە بەدرێژایی سەردەمی چوار خەلیفەکەش هەر بەردەوام بوو. بەڵام ئەمەوییەکان کاتێ هاتنە سەر حوکم، لەم دەستووره لایان دا و کەوتنە ڕەگەزپەرستی: بە چاوی سووکەوە تەماشای

نەتەوەکانی غەیری عەرەبییان دەکرد و پێیان دەگوتن «موالي». بەم شێوەیە، لە ئەنجامی دژایەتیکردنی میللەتانی غەیری عەرەب لەلایەن ئەمەوییەکانەوە، شعووبیەت سەری هەڵدا.

لە سەدەی حەوتەمی مەسیحییەوە پەخشانەکانی ئیسلامی کۆدەکرانەوە و دەنووسرانەوە، ئەمەش بە خەتی کووفی و بەبێ نوختە بوو.

سەجادی



٦٦١- ٧٥٠

## فەرمانڕەوایەتیی "ئەمەوییەکان"

## لە کوردستاندا

لە ماوەی سەردەمی خەلافەتی ئەمەوییەکاندا زۆربەی کورد وردە وردە دەچنە ژێر ئاڵای ئیسلامەوە، خزمەتی شارستانیەتی ئیسلام دەکەن.

٦٦١ ـ ٧٥٠

زنجیرەیەک راپەڕینی کورد دژی ئەمەوییەکان.

دوای سەر هەڵدان و بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام مێژوونووسانی عەرەب و موسڵمان، بەهەمان شێوە، ئەوانیش نەک رێبازی نەتەوە Nation ، بگرە رێبازی دین (ئاینی ئیسلامیان) بۆ نووسینەوەی ژیان مێژووی گەلان پەیڕەوی کرد، هەموو موسڵمانان، بەبێ جیاوازیکردنی زمان و رەگەز بە (ئوممەت/ الامة) نێو نرابوون. هیچ نەتەوەیەک، نەمازە کورد، بام زمان و رەگەزیشی جیاواز بێت، بەڵام بۆی نەبوو لە سنوورێکی ئیداریی دابڕاودا خۆی لە ئیمپراتۆریەت و «ئومەتی ئیسلام» جیا بکاتەوە؛ ئەو ئیمپراتۆریەتە ئیسلامییە رێگەی نەدەدایە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ خۆی دابمەزرێنێ. هەر بۆیەش دەبینین بۆ نموونە لە سەردەمی خەلافەتی عومەردا (٦٣٤ی زاینی) بەشێکی فراوانی وڵاتی کوردنشین لکێنرابووە هەرێمی ئازەربایجان، بەشەکەی تریشی بەناوی ئیقلیمی (جەزیرە) ناوزەد کرابوو.

هەمان ئەم جۆرە دابەشکردنە ئیداری- جوگرافییەی کوردستان، لە سەردەمی ئەمەوییەکان (٦٦١- ٧٥٠) تەنانەت تا کۆتاییی سەردەمی عەباسییەکانیش (٧٥٠- ١٢٥٨) وەک خۆی مابووەوە؛ واتە لەژێر ناوی (ئازەربایجان ) و (جەزیرە) و (عێراقی عەجەم) و (عێراقی عەرەب) و (جیبال).

بە درێژاییی مێژووی ئیسلام تا دەمەدەمی کۆتاییی دەسەڵاتی عەباسییەکانیش (٧٥٠- ١٢٥٨) هیچ یەکەیەکی ئیداری (وحدة ادارية) بەناوی «کوردستان» لە مێژووی سیاسی ئیسلامدا و لەسەر نەخشەی جوگرافیای سیاسیی رۆژهەڵاتدا بوونی نەبووە.



٦٦١- ٧٥٠

## فەرمانڕەوایەتیی "ئەمەوییەکان"

## لە کوردستاندا

ئەمەوییەکان کاتێ هاتنە سەر حوکم کەوتنە رەگەزپەرستی: بە چاوی سووکەوە تەماشای نەتەوەکانی غەیری عەرەبییان دەکرد، پێیان دەگوتن «موالي». بەم شێوەیە، لە ئەنجامی دژایەتیکردنی میللەتانی غەیری عەرەب لەلایەن ئەمەوییەکانەوە «شعووبیەت» سەری هەڵدا. ئەم بە چاوی سووک سەیرکردنە میللەتانی غەیری عەرەب تەنانەت تا سەردەمی عەباسییەکانیش هەر تا رادەیەک بەردەوام بوو. (عبدالرحمن بن مستخلف)، شاعیرێکی ئەو سەردەمە، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٢٩دا، بەم شێوەیە گاڵتە بە کولتووری کورد و ئاگردانە زەردەشتییەکانی شاری هەولێر دەکات:

اربل دارالفسق حقا، فلا
يعتمد العاقل تعزيزها
لو لم يكن دار فسوق لما
اصبح بيت النار دهليزها

یاقوت الحموی:

معجم البلدان، ج ٢، ل ٢٢٥

٧٠٦- ٧٤٣

مۆسیقاژەنی کورد، ئیبراهیم کوڕی ماهان کوڕی بەهمەن (الموصلي)؛ یەکێک لە ناودارترین گۆرانیبێژەکانی سەردەمی ئەمەوی لە دەوروبەری (٧٠٦- ٧٤٣ ز.)، خزمەتێکی گەورەی مۆسیقا و گۆرانیی ئیسلام و عەرەب دەکات: یەکەمین کۆنسێراڤاتواری ئیسلامی دادەمەزرێنێ، پاشان کوڕەکەی، ئیسحاق، پەرەی پێ دەدا. شاگردەکەیشی «زەریاب» کە ئەویش هەر کورد بووە، ئەم هونەرە شارستانییە دەگەیەنێتە «قورتوبە» و «مەغریب» و «ئیسپانیا». (الحصري) لە (جمع الجواهر في الملح و النوادر) باسی کردووە.

دووسەد ساڵ پاش داهاتنی ئیسلام وردە وردە

### ٦٩٤ ـ ٧١٤

کورد یارمەتیی حەجاجی سەقەفییان داوە بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی خاریجییەکان بە سەرۆکایەتیەی موتریفی کوڕی ئەلوغەیری:

زۆر کـــار ئەرەب کـــەردنە خـــاپـوور
کـــوناو پـالەیـی هـەتا شـــــارەزوور
شـن و کـــەنیکان وەدیل بە شـــینا
مـــێـــــرد ئازاتلی وەڕووی هـوینا
ڕەوشت زەرتوشتـــرە مـانەوە بێ دەس
بەزدیێکا نێکا هـۆرمـز وە هـیـچ کـەس

### ٧٢٧

طیمثاوسی گەورە، پاتریارکێکی ناوداری مەسیحییەکان (نەستۆرییەکـان) بووە، لە هەولێر لەدایک بووە ( ٧٢٧ ـ ٧٢٨ م). لە سەردەمی عەباسیدا لە هەولێر هـەوڵی ئاشتیی نێوان مەسیحییەت و ئیسلامی داوە.

### ٧٤٤ـ ٧٥٠

لە دەوری دوا خـەلیفـەی ئەمـەوی، مـەروانی دووەم کـە لە دایکەوە کـــورد بوو و مـــاوەیەک فـــەرمـــانڕەوای ناوچە کوردنشینەکان بوو ٧٤٤ ـ ٧٥٠. جـمـوجـۆڵی کـورد دژ بە فەرمانڕەوایەتیی ئەمەوی.

### ٧٤٧

لە مـێـــرگی مـــەروە ڕاپەڕینێک بە ســـەرۆکـایەتیـــەی ئەبومـــوسلیـــمی خـــۆراســـانی هـەڵبـــوو، ناوچە کوردنشینەکانیشی گرتەوە. ئەمەوییەکان لە شارەزووردا شکان.



خەتەکانی ولاتی ئێران - کە پاشماوەی خەتەکانی ڕۆمانی و یۆنانی بوون - لەناوچوون و کـەوتنە سـەر نووسین بە خەتی عـەرەبی. تەنیا شێوە خەتی سوریانی مایەوە کە بەکار دەهات.

### ٧٤٠- ٨١٠

ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم کوڕی ماهان کوڕی بەهمەن (الموصلي)، یەکێک لە ناودارترین گـۆرانیـبێژەکـانی سـەردەمی عـەباسی لە دەوروبەری (٧٤٠- ٨١٠). لە یەکێک لە شاگردەکانی لای باوکی خۆیەوە، بە ناوی (زەلزەل) فێری عوود بووە، لە (ئاتکە)ی کچی (شەزا)وە فێری گۆرانی بووە. لە هەشتا ساڵی مردووە. (الحصري) لە (جمع الجواهر في الملح و النوادر) باسی کردووە.



سەردەمی عەباسییەکان

٧٥٠- ١٣٥٨

## سەردەمی خەلافەتی عەباسی
## لە کوردستاندا

خەلافەتی عەباسییەکان، کە لە سەدەی دەیەم بەملاوە دەسەلاتیان بەرەو کزی دەڕوا، ڕێگە خۆش دەکا کە چەند میرنشینێکی کوردی دروست بێن.

لە سەردەمی خەلافەتی عەباسیدا، سەبارەت بەوەی عەباسییەکان پشتیان بە غەیرە عەرەب بەستبوو، هەوڵیان دا ئیعتبارێک بۆ نەتەوەکانی غەیرە عەرەب بگێڕنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە سەردەمی عەباسییەکاندا دوو بەرە دروست بوون: بەرەی عەرەب و بەرەی غەیرە عەرەب. تورکەکانی غەزنەوی و سەلجووقی وایان بە باش زانی کە خۆیان بدەنە پاڵ عەرەب.

### ٧٥٤

ئەبو موسلیمی خۆراسانیی کورد لایەنگیری عەبباسییەکان دەکات و کورد ڕادەکێشێتە ژێر چەتری خەلافەتی عەباسی.

### ساڵانی ٨٠٠

- بزووتنەوەی سیاسی ـ ئاینیی حورەمییەکان لە ناوچەی جیبال و کوردنشینەکاندا.
- بەشداریکردنی کورد بە سەرۆکایەتی جەعفەر کوڕی حەمید ئەلکوردی کە فەرمانڕەوای ناوچەیەکی سووریا بووە، لە بزووتنەوەی قەرمەتییەکاندا.

### ٨٣٨

ڕاپەڕینێکی گەورەی کوردان لە شاری مووسڵ بە سەرۆکایەتی جەعفەر کوڕی فەهەرجەس دژی عەباسییەکان کە تا ٨٤٠ درێژەی کێشا.

### ٨٤٠

- خەلیفە موعتەسەمی عەباسی هێزێکی گەورەی تورکەکانی



٧٥٠- ١٣٥٨

## سەردەمی خەلافەتی عەباسی
## لە کوردستاندا

زەریاب (واتە ئەو کەسەی زێڕ دەدۆزێتەوە) گۆرانیبێژ و مۆسیقازەنێکی کورد بووە (بەغدا ٧٨٩- قورتوبە ٨٥٧)، کوڕی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی نافیع، لە کاتی گەنجێتیدا سەری خۆی هەڵگرت چووە بەغدا و لەوێ بووە شاگردی (ئیسحاق الموصلي)، تا وای لێ هات لە دیوەخانی هاروونە ڕەشید گۆرانی بڵێت و مۆسیقا بژەنێت و شۆرەتێکی مەزن پەیدا بکا. ئەمە مامۆستاکەی خۆی تووشی حەسوودی کرد، زەریاب (بەغدا ٧٨٩- قورتوبە ٨٥٧) بۆیە ناچار بوو سەری خۆی هەڵبگرێت و بچێتە ئەندەلووس، کە ئەو کاتە عەبدولڕەحمانی دووەم خەلیفەی ئەوێ بوو. خەلیفەی ئەوێ سەرسامی دەنگ و مۆسیقاکەی، ڕێگەی پێ دا یەکەمین قوتابخانەی گۆرانی و مۆسیقا لەوێ بکاتەوە. مێژوونووسەکان دەڵێن: زەریاب (بەغدا ٧٨٩- قورتوبە ٨٥٧) موەششەحاتی ئەندەلووسیی داهێناوە، کە لە ڕووی سیستەمی قافییەوە دەقاودەق لە حەیرانی دەشتی هەولێر دەچێ. هەر ئەویش پێنجەمین ژێی بۆ عوود زیاد کردووە، جگە لە داهێنانی چەند مەقامێک کە پێشتر نەبوونە. هەندێ مێژوونووس ڕایان وایە کە هەر ئەویش مۆسیقای فلامینکۆی دامەزراندووە. زەریاب لە قورتوبە لە ساڵی ٨٥٧ کۆچی دوایی کردووە (هەندێ سەرچاوەش دەڵێن لە ٨٤٥ مردووە).

### ساڵانی ٨٠٠

لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە (لە سەدەی نۆیەمی مەسیحی بەملاوە) هەندێک لەو نەتەوە غەیرە عەرەبانەی لەژێر دەسەڵاتی ئیسلام و لەژێر کاریگەریی زمانی عەرەبیدا دەژیان، وردە وردە کەوتنەوە سەر نووسین بە زمانی خۆیان، لەوانە: زمانی فارسی کە هەنگاوی گەورەی هەڵنا. دواتریش، زمانی تورکی، کە لە هەوارە کۆنەکەی ڕۆمانییەکاندا سەری هەڵدابوو، بەهەمان خەتی عەرەبی

## ژیانی سیاسی

بە سەرۆکایەتیی ئایتاخ دژ بە کورد بەگەڕخست: یەکەمین پێکدادانی تورک و کورد لە مێژوودا. ڕاپەڕینەکە کپ دەبێتەوە.

– جەعفەر سەرۆکی هۆزی دونبەڵیی کورد سەرکردایەتیی ڕاپەڕینێکی شاری مووسڵ دەکات دژی خەلیفە موعتەسەم.

**٨٨٠**

عەلی کوڕی داودی هەزارمێردی کە کورد بوو فەرمانڕەوایەتیی مووسڵی دەکرد.

**٨٩٣**

لە ئەنجامی جموجۆڵی کوردەکان، خەلیفەی عەباسی، ناچار بووە کوردێک (عەلی کوڕی داود کوڕی ڕوخزادی کوردی) بکاتە فەرمانڕەوای مووسڵ. عەرەب بەمە نیگەران دەبن و لە دوو دێڕ شیعردا ڕەنگ دەداتەوە: «مووسڵ لەژێر چنگی کورداندا ریسوا بووە».

**٩٢٩- ١٠٠٤**

لە سەردەمی دەسەڵاتی عەباسییەکاندا: میرنشینی کوردە حەمدانییەکان لە ناوچەی جەزیرە و سووریا.

**٩٥١- ١١٧٤**

میرنشینی کوردە شەددادییەکان لە (گەنجە)ی ڕۆئاوای باکوری کوردستاندا.

**٩٥٩- ١٠١٥**

میرنشینی کوردە حەسنەوییەکان لە باشووری کوردستاندا.

**٩٦١**

قەڵای بەتلیس و (سیرت) لەلایەن میری دۆستەکییەوە لە ساڵی (٩٦١) دروست کراوە.

**٩٩٠- ١٠٩٦**

میرنشینی کوردە مەروەندییەکان (دەوڵەتی دۆستەکی) کە

## ژیانی کولتووری

پەرەی سەند و بڵاوبۆوە.

بەڵام زمانی کوردی، پێ دەچێ، قەدەغەکراو، لە هیچ بەستێنێکدا بەکار نەهاتبێت: نووسەر و میرە کوردەکان هەر بە عەرەبی نووسیویانە و خزمەتی ئیسلامیان کردووە.

**٨٧٧- ٩٢٩**

ئەستێرەناسی کورد، (ابو عبدالله محمد) چارمونجەی مەرانی.

**٨٧٨- ٩٦٢**

نیگارکێشی کوردی خەڵکی سندی، ئەبوبەکر محەمەد کوڕی داود.

**٨٧٩**

(احمد داود ابو الحنيفة الدينوري) (زانایەکی کوردە، لە سنە لەدایک بووە و ساڵی ٨٩٥ مردووە)، کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی (کتاب الاخبار الطوال) کە باسی ئێرانی سەردەمی ئەسکەندەری مەقدۆنی دەکات تا ناوەڕاستی سەدەی نۆیەم.

**٨٩٣**

ابن خرداذبه لە کتێبی (اللهو و الملاهي) باسی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی دەکا.

**٩٠٠**

نووسەری سەدەی دەیەم، ئەلتەنووخی، ناوی (لسان الاكرادي) هێناوە. ئەمە مانای وایە کە پێش ساڵانی ٩٠٠، زمانێک بە ناوی (زمانی کوردی) تەنانەت لای عەرەب و دراوسێکانی تریشمان دانی پێدا هاتووە و هەبووە.

– (ابن وحشية النبتي) ٢٢٤-٣٤٦ی کۆچیدا، لە کتێبی (شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام) لە ٣١٢ی کۆچییدا دەڵێ: (من لە شاری بەغدا چاوم بە سێ بەرگ کتێبی کوردی کەوت کە بە خەتێ ماسیی سوراتی نووسرابوون و ئێستاش لە شام دوو بەرگ لەو کتێبانەم لەلایە کە یەکێکیان باسی پەروەردەکردن و چەقاندنی دارخورما دەکات و ئەوی

پایتەختیان لە (میا فارقین) نێزیک دیاربەکر بوو. (أحمد بن یوسف الارزق الفــارقي) (١١١٧- ١١٨١)، لەدایکبــووی (میافارقین) یەکەمین مێژوونووسی کوردە کە لە (١١٧٦) بە زمانی عەرەبی لە (تاریخ الفارقي)، ڕووداوەکانی دەوڵەتی دۆستەکیی نووسیوەتەوە. دیاربەکر و بەتلیس و نوسەیبین و وان و ئەلعــەزیزە لەژێر دەســەڵاتی مــیــرانی ئەو دەوڵەتە کوردییەدا بوونە کە عەرەب پێی دەڵێن (الدولة المروانية) و پاشان بەدەستی تورکە سەلجووقییەکان لەناوچوو. ساڵی (٩٨٩ ز) مــیــر باد مــیــری دەوڵەتی دۆســتــەکی بووە. دوا میریشیان ناوی (ناصر الدولة ١٠٨٠- ١٠٨٦) بووە کە بە شەوبێری و جارییە و کەنیزەک و ڕابواردنەکانییەوە، زۆر ناودار بووە.



تریان لەبابەت دۆزینەوەی ئاوە لە جێگەی وشک و بێ ئاودا. ئەز ئەو دوو کتێبەم وەرگێڕایە سەر عەرەبی..).

– لە سەردەمی دەوڵەتی دۆستەکی (٩٩٠ - ١٠٩٦ ) واتە مەروەندییەکان (٢٧٢- ٤٧٨ی کۆچی) لە ناوچەی دیاربەکر و جەزیرەدا بایەخ بە گۆرانی و مۆسیقای کوردی دراوە.

## ٩٣٥ – ١٠١٠

بڵاوبوونەوەی یەکەم تێکستی شیعری کوردی: بەرهەمەکانی شاعیری کورد بابا تاهیری هەمەدانی (٩٣٥- ١٠١٠) بە زاراوەی لوڕی: یەکەم زمانی ستانداری کوردی. (ذبيح الله صفا) لە (تاریخ ادبیات در ایران) دەڵێ: بابا تاهیر کورد بووە و زاراوەی لوڕی زاراوەیەکی کوردییە).

## ٩٩٠ - ١٠٩٦

لە سەردەمی میرەکانی دەوڵەتی دۆستەکی، نەک هەر ڕاو و شکار، بگرە خۆ سەرخۆشکردن و مەجلیسی خواردنەوە و گۆرانی و شەوبێری و ڕابواردنی ناو حەرەمسەراکان و سترانگوتنی ژنان بە عوود لێدان و سەماوە.. زۆر گەرم بووە.

– لە کاتی دەوڵەتی دۆستەکیدا باس لە پارەیەک بە ناوی (ئەرمانۆس) کراوە. (الفارقي) لە ل (٩٣)ی کوردییەکە باسی دەکا.

(فخر الدولة) کە دوو ساڵ میری دەوڵەتی دۆستەکی بووە، (ابن الفارقي) دەڵێ: «لە ساڵی ١٠٨٧ (فخرالدولة) دێری عیبادی کردبووە مزگەوت، بەڵام مەسیحیانی میافارقین سی هەزار دیناری ئەرمانۆسیان پێ دا و کردیەوە دێر».

(ابن الفارقي) دەڵێ: «لە ساڵی ١٠٨٨ سوڵتان مەلیکشا مووسڵی لەژێر دەستی میر ئیبراهیم قورەیش هێنایە دەرەوە و دایە دەست (عميد الملك) (عميد ابو علي) کە بە چاکترین شێواز خەڵکی بەڕێوە دەبرد.. دادوەر و چاکەخواز بوو.. وتراوە: شەوێک لە کۆشک خەوتبوو، لە کاتی بەرەبەیاندا گوێبیستی دەنگی کڵێسە بووبوو، وتی: ئەمە چییە؟ پێیان گوت: ئەمە دێری عیبادە لە سەرووی کێوەکەوەیە. کە بەیانی داهات لەگەڵ خەڵک کۆبووەوە و گوتی: لە وڵاتی موسڵماناندا زەنگی ناقووسمان لەسەر سەری لێ دەدرێ: دیارە ئێمە لە

## ٩٩١ - ١١١٧

میرنشینی کوردەکانی بەنوونەنناز

## ٩٩٥

تورکە سەلجووقییەکان لە ٩٩٥دا رۆژهەڵاتی ئێران پاشانیش لە ١٠٢٩ مەراغە و کوردستانی ئێران، ئنجا لە ١٠٥٦ مووسڵ، دواتریش لە ١٠٧٧ ئەنادۆڵ دەگرن. ئیتر کاریگەریی کولتووریی خۆیان (کولتووری سەلجووقی) بەسەر کوردستاندا بڵاو دەکەنەوە.







قوستەنتەنیەین، وتیان: ئەی کەوردەمان ئەوە جارێکیان کرابووە مزگەوت و مەسیحییان کردیانەوە دێر، فەرمانی دا لە جێگەی کوشتارگای قوربانیی مەسیحییان لە دێرەکەدا میحراب دروست بکرێ و کرایە مزگەوت و ناونرا مزگەوتی فەتح. جا مەسیحییان کۆبوونەوە و پەنجا هەزار دیناریان پێشکێش کرد، لێی وەرنەگرتن. تا ئێستە مزگەوتەکە وەکو خۆی ماوەتەوە».

## ٩٥٠ـ١٠٥٠

- پیر شالیاری زەردەشتی بە زمانی کوردی (گۆران) شیعر دەنووسێ.

- کتێبی (الف ليلة و ليلة) لەکەڵێک دیمەندا باسی کوردی کردووە (بەرگی یەکەم، ل ٦٠٩ ــ ٦٢٣، بەرگی دووەم، ل ٢٤٢ـ ٢٩٥). یەکەم جار، المسعودي، لە (مروج الذهب) لە ساڵی ١٠٥٦ ئاماژەی بۆ کردووە.

## ٩٥٧

- المسعودي (٩٥٧ ز) لە کتێبی (مروج الذهب)دا باسی گۆرانیی کوردی و شمشاڵی کوردی دەکا لای شوانە کوردەکان.

- ئامێری مۆسیقاناسەکان، لەوانە (فرانسوا رێنێ ترانشیفۆر francois- Rene Tranchefort) لە کتێبی «ئامێرە مۆسیقاییەکان لە جیهاندا Les ins truments de Muiquedans Lemond » کە بە فەرەنسی لە ١٩٨٠ لە پاریس لە دەزگای seuil چاپ کراوە، لە لاپەڕە ١٦٠-١٥٩-١٠٠ ) بنەچەی گەلێک لە ئامێرە مۆسیقاییەکانی رۆژهەڵات، وەک (تەنبوور) و (بوزک/ بزخ Bazuq ) دەگێڕێتەوە بۆ کورد، دەڵێ کە لە سەرەتادا (لە سەردەمی عەباسییەکاندا) کورد ئەو ئامێرە مۆسیقاییانەی داهێناوە.

## ٩٧٧

(ابن حوقل) لە کتێبی (صورة الارض)دا دەسنیشانی شوێنی جوگرافیی کورد دەکات: (مشاتي الاكراد و مصايفهم ). بۆ یەکەم جار ناوی (الاكراد) لەناو کتێبی جوگرافیای زانا موسڵمانەکان دەردەکەوێ.




هەرێمی چیا (اقلیم الجبال) لە کتێبی (صورە الارض)ی ابن حوقل
(٣٦٧ک/٩٧٧م)

## سەدەی ١٠ تا سەدەی ١٤
## بووژانەوەی میرنشینە کوردییەکان
## لە سەردەمی خەلافەتی عەباسی
## ٧٥٠- ١٣٥٨
## لە کوردستاندا



کوردێکی سووریا



## سەدەی ١٠ تا سەدەی ١٤

لە سەدەی دەیەم تا چواردەم چەند زانایەکی موسڵمان ناوی کورد دەهێنن: (الطبري) (٨٣٨-٩٢٣) کە باسی خەلیفە مەروان دەکات دەڵی بە بنەچە کوردە (كتاب اخبار الرسل و الملوك، ج ٣، ١، ص ١٥)؛ الیعقوبي (٩٠٦)؛ (الاصطخري) لە ٩٥١ مردووە؛ (المسعودي) (٩٥٧) کە کۆمەڵێک زانیاریمان لەبارەی هۆزە کوردەکان دەداتێ (مروج الذهب، چاپی ١٩٦٥، ب ٢، ل ١٢٢ ـ ١٢٣؛ ب ٣، ل ١٠٠ و ٢٥٣؛ ئنجا ابا دلف بن المهلهل الخزرجي لە ٩٥١ سەری لە کرماشان داوە و باسی دەسترەنگینییەکانی پەیکەرتاشێکی کورد دەکات بەسەر تاق و دیوارەکانی قەسری شیرینەوە، هەروەها باسی ژیانی شارە کوردییەکان؛ ابن حوقل (٩٧٧)؛ المقدسي (١٠٤٨)، ابن البلخي (١١٠٦)، ابن الاثیر (١١٦٠ـ ١٢٢٣)، ابن جبیر (١٢١٧)، یاقوت الحموي (١٢٢٩)، پاشان حمدالله مستوفي القزويني (١٣٤٩).

هەروەها چەند زانایەکی کوردیش بۆ خزمەتکردنی ئیسلام، چەند سەرچاوەیەکیان بە عەرەبی نووسیوە و لابەلا باسی کوردیان کردووە:

١- ابو البرکات ابن المستوفي (لە ١١٦٩ لە قەڵاتی هەولێر لەدایک بووە)، شاعیر، وەزیری دەوڵەتی عەباسی، مێژوونووس: دە بەرگ کتێب لەبارەی شەرحی دیوانی «المتنبي»، چوار بەرگیش لەبارەی مێژووی هەولێر بە زمانی عەرەبی (تاريخ اربل: نباهة البلد الخامل بمن وردة من الاماثل). لە ساڵی ١٢٣٩ لە شاری مووسڵ کۆچی دوایی دەکات.

٢- ابن خلكان (١٢١١ هەولێر). (وفیات الاعیان وانباء ابناء العنان) کە بیست ساڵ پێوەی خەریک بووە.

٣- ابن الاثیر (١١٦٠- ١٢٢٣) لە ناوچەی جەزیرە و بۆتان لەدایک بووە. لە نموونەی بەرهەمەکانی: (الكامل في التاريخ) کە بە دەستکارییەوە لە (تاريخ الطبري) یەوە وەری گرتووە.

### سالآنی ۱۱۰۰

دەرکەوتنی یەکەمین میر و میرنشینە ئەردەڵانییەکان.

میرنشینی ئەردەڵانەکان بارەگایان لە سەرەتادا، لە ساڵی (۱۱٦۸) لە قەڵای زەڵم بوو، پاشان لە ۱۱٦۱ چوونە قەڵای مەریوان.

### ۱۱۳۷

لەدایکبوونی سەڵاحەدینی ئەیووبی کە لە ۱۱۸۷ قودس دەگرێ.

### ۱۱۲۸- ۱۲۲۳

هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگییەکان (۱۱۲۸- ۱۲۳۳) دەبووژێتەوە. (یاقوت الحموي) لە (معجم البلدان). دەڵێ کە خەندەقێک لە دەوری هەولێر، قەڵاتەکەیشی شوورەیەکی هەبووە. (یاقوت الحموي) شیعرێکی شاعیرێکی عەرەبی نووسیوەتەوە، بەناوی( انوشروان البغدادي)، ناسراو بە (شیطان العراق الضرير) کە لە شیعرێکی درێژدا زەمی هەولێر و پیاوماقووڵە کوردەکانی هەولێری کردووە.

### ۱۱۵۰

سوڵتان سەنجاری سەلجوقی ئۆتۆنۆمی دەداتە کوردەکان: پەیدابوونی وشەی (کوردستان) و بەکارهێنانی زاراوەی «کوردستان» بۆ یەکەمین جار وەک زاراوەیەکی ئیداری - سیاسی.

لە ناوەڕاستی سەدەی دوانزدەمی مەسیحیدا سەنجار سوڵتانی سەلجووقی Sanjar سەبارەت بە پاڵەپەستۆی کورد، ڕۆئاوای هەرێمی جیبال کە سەر بە کرمەشان بوو، جیای کردەوە و کردی بە ئوستانێکی سەربەخۆ و ناوی نا «کوردستان» پاشانیش ئەم ئوستانەی خستە ژێر دەسەڵاتی برازاکەی خۆی (سولەیمان پاشا) کە لە ماوەی ۱۱٥٦ تاکو ۱۱٦۱ی زاینی دەسەڵاتداریتی ئەم ئوستانەی کرد؛ دوای ئەویش مامەکەی دەسەڵاتی گرتە دەست و بووە سوڵتانی هەر دوو عێراقەکە: عێراقی عەرەب و عێراقی عەجەم». شاری بەهار کە ۸ میل لە باکوری شاری هەمەدانەوە دوورە،



### ۱۰۷۱

دیوانە شیعرێکی شاعیری سوێدی (گوننار ئەکەلۆف) بەناوی (دیوانێک لەبارەی میری ئەمگیۆن) باسی بەگزادەیەکی کورد دەکا کە لە ساڵی (۱۰۷۱) لە شاری مەلازگەرد لە شەڕی ساڵی (۱۰۷۱) لەلایەن بێزەنتییەکانەوە بەدیل گیراوە و دواتر هێندراوەتە ئەستەمبوڵ. ئەم بەگزادە کووردە چوار پێنج ساڵ لە زیندانی (ڤلاچێرنە)ی ئەستەمبوڵدا بە دیلی ماوەتەوە و ئەشکەنجەیەکی زۆر دراوە و پاشان چاوەکانی هەڵکۆڵدراوە.

### ۱۰۷٦

(محمود الغشقري) کە جوگرافیاناسێکی موسڵمانی بە بنەچە تورک بووە و لە ناوەڕاستی سەدەی یازدەمدا لە ناوچەی (کاژغەر)دا ژیاوە، لە ساڵی (۱۰۷٦)دا نەخشەیەکی جوگرافی- سیاسی لەبارەی وڵات و گرووپە ئەتنیکییەکانی کیشوەری ئاسیا دروست دەکات و لە (ديوان لغات الترک) بە زمانی عوسمانی بڵاوی دەکاتەوە. لەو نەخشەیەدا ناوی گەلی کورد و وڵاتی کوردیشی هێناوە.

لەو نەخشەیەی (غەشقەری)دا ناوی وڵاتی کورد بە (ارض الاکراد) هاتووە، کە دەکاتە (خاکی کوردان).

ئەم نەخشەیەی (غەشقەری) بە دووەمین نەخشە و سەرچاوەی جوگرافی لە قەڵەم دەدرێ کە ناوی گەلی کوردی وەک نەتەوەیەک هێنابێ.

لەم نەخشە جوگرافییەشدا هەر زاراوەی (کوردستان) بەکار نەهاتووە. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە جارێ وشەی (کوردستان) و زاراوەی «کوردستان» هێشتا نەبووەتە زاراوەیەکی ئیداری - سیاسی.

### سالآنی ۱۱۰۰

- دەرکەوتنی مۆسیقای پیرۆزی ئەهلی هەق.

- موبارەک شا، ناسراو بە (شا خوشین ۱۰۱٥ ـ ۱۰۷٤) لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا وەدیار کەوتووە، بە تەنبوور گۆرانیی پیرۆزی ئەهلی هەقەکانی گوتووە بە (دیالێکتی گۆران)؛ تیپێکی فراوانی مۆسیقاژەنی ئەهلی هەقی هەبووە،

پایتەختی ئەم ئوستانەی کوردستان بووە؛ پاشانیش (سوڵتان ئاباد) کە لە نزیک چەمچەماڵ و چیای بێستوونە، لە باتی ئەو کرایە پایتەخت».

### ۱۱٦۹ -۱۲٥۰

میرنشینی کوردە ئەیووبییەکان، لە رۆژئاوای کوردستانەوە تاکو میسر. سەدەی ۱۱ و ۱۲ و ۱۳: میرنشینی کوردەکانی شوانکارە (شبانکارە) لە باشووری رۆژهەڵاتی کوردستاندا.

### ۱۱۸۷

- سەڵاحەدینی ئەیووبی قودسی رزگار کرد.
- شەڕی خاچپەرستەکان لە سەدەی ۱۲مدا، بە سەرکردایەتیی سەڵاحەدینی ئەیووبیی کورد بوو کە لە نێوان رۆژهەڵاتی موسڵمان و رۆژئاوای مەسیحیدا، لەپێناو دەستداگرتن بەسەر "خاکی پیرۆز" لە فەڵەستیندا رووی دا؛ بە سەرۆکایەتیی سەرگەڤازێکی کورد بوو کە سەرکەوت بەسەر سەرکردایەتیی ئەورووپای فیلیپ ئۆگەستی فەرەنسی Philippe Auguste (۱۱٦٥_ ۱۲۲۲) و ریچارد شێردڵی ئینگلیز ( ۱۱٥۷- ۱۱۹۹) Richard Coeur de lion کە لەو شەڕەدا لایەنگیری فەرەنسا بوو.



"حصن الاکراد" لە نزیک حەلەب



لە ناوچەکانی کرمەشان و ئیلام و هەوراماندا هەبووە. (۹۰۰) ئاوازی لەبارەی دینی (یاری)یەوە داناوە.
- مۆسیقاژەنەکانی ئەهلی هەق: تەمیر، یار محەمەد، پیر کەرەم، رەزا شاوەیس، هەمزە، عەبدولرەحمان.. کە لە کۆشکی پاشا سترانیان دەچڕی و ناویان لە (شانامەی هەقیقەت)دا هاتووە.

### ۱۰۷۳-۱۱٦۳

شێخ ئادی، رێبەری مەزهەبی یەزیدی؛ گومبەز و پەرستگاکان و لالش پڕ دەکات لە نەخش و رۆلیێفی پەیکەرتاشی و ئاواز و تەمبوور و ئامێرەکانی تری مۆسیقا.

### ۱۰۸٤_۱۱٦٥

بابا ناووس، شیعری بە کوردی نووسیوە (دیالێکتی گۆران).

### ۱۱۳۷

(ابن خلکان) لە (وفیات الاعیان) دەڵێ کە یەکەم قوتابخانە لە هەولێر لە ساڵی (۱۱۳۷) دەرگەکانی خرایە سەر پشت.

### ۱۱٦۳

یەکەمین جوگرافیاناسی ئەورووپایی هاتبێتە کوردستان جوولەکەیەکی ئیسپانی بووە: بنیامێن دو توودێل B. DE TUDELE کە لە ماوەی ساڵانی ۱۱٦۳_ ۱۱۷۳دا لە رۆژهەڵات ماوەتەوە و سەفەرنامەکەی خۆی بە ناونیشانی ( Sefer ha- masaot shel Rabbi Benjamin) نووسیوەتەوە.

بنیامێن دو توودێل ئەوەمان بۆ باس دەکات کە لەو سەردەمەدا بزووتنەوەیەکی سیاسیی جوولەکە لە ئارادا هەبووە، بە رێبەرایەتیی جوولەکەیەکی کوردستان بەناوی داڤید ئەلرۆی David Alroy (کە لە پایتەختی میرنشینی بادینان، لە شاری ئامێدی لەدایک بووە). داڤید ئەلرۆی Da-vid Alroy شاری ئامێدیی کردبووە پێگەی ئەم بزووتنەوەیەی خۆی و پێوەندیی زۆر پتەویشی لەگەڵ کوردەکاندا هەبوو، تەنانەت چەکدارە کوردە یەزیدییەکان پشتیوانیشیان دەکرد.

## ١١٩٤ -١٢٣١

بنەماڵەی خوارزەمشاهییەکان لە ساڵی ١١٩٤دا توانییان دەسەلات بەسەر ئەو بەشەی کوردستانی ژێر دەسەلاتی سەلجووقییەکاندا بگرن و لە جیاتی سەلجووقییەکان فەرمانڕەوایەتی ئەو بەشەی کوردستان بگرنە دەست.

لەو سەردەمەی بنەماڵەی خوارزەمشاهییەکاندا (١١٩٤-١٢٣١) کوردستانی گەورە لە نێوان چوار دەوڵەتی گەورەدا دابەش کرابوو؛ بەشی رۆژهەلاتی: لەژێر دەسەلاتی خوارزەمشاهییەکاندا بوو، بەشی باشووری: لە ژێر دەسەلاتی عەباسییەکاندا بوو، لای باکوری- رۆژئاوایشی: بەشێکی لەژێر دەسەلاتی ئەیووبییەکان و بەشەکەی تریشی هێشتا هەر لەژێر دەسەلاتی سەلجووقییەکاندا بوو.

## ١١٩٧ -١٨٦٤

میرنشینەکانی ئەردەڵان لە کوردستانی ئێران بەردەوامن لە دەسەلات.

## ١٢٢٠ -١٢٢٣

- مەنگۆلەکان لە باکوری رۆژهەلاتی ئێرانەوە دێن و ئێران داگیر دەکەن، دەسەلاتیان وردە وردە بەرەو رۆژئاوای کوردستان پەرە دەسێنێ.

- (یاقوت الحموي) (معجم البلدان، ج ١، ص ١١٦ و ١١٨) لە کورد زیاتر باسی هیچ نەتەوەیەکی تر ناکا لە هەولێر، دەڵێ کە هەولێر زۆربەی دانیشتووانی کورد بوونە: (اکثر اهلها اکراد استعربوا و جميع رساتيقها و فلاحيها و ما ينضاف اليها اكراد).

(ياقوت الحموي) (معجم البلدان، ج ١، ص ٢٥٣) باس لە بازرگانی و دروستکردنی قوماش و (بز) دەکا لە هەولێر. بەهەمان شێوە (ابن بطوطة) لە سەفەرنامەکەی خۆیدا، لە لاپەڕە ٢٥٢.

## ١٢٣١

ئیبنولستەوفی کرا بە وەزیری دارایی هەولێر.



- ماری کەرملی لە ١٩١١ لە گۆواری Anthropos لە ڤیەننا هەردوو کتێبەکەیانی، بە ئەلفابێ تایبەتییەکەیانەوە بڵاو کردەوە.

- کتێبی جیلوە، مسیۆنێری ئەمەریکایی ئەنریووز دەڵێ کە لە ١١٦٣ نووسراوە.

- کتێبی مەسحەفا رەش، مسیۆنێری ئەمەریکایی ئەنریووز دەڵێ کە لە ١٣٤٣ نووسراوە.

ڤیچڤسکی دەڵێ کە هەردووکیان لە سەدەی ١٧مدا نووسراون، هەندێکیش دەڵێن کە لە سەدەی ١٩ز. هەردووکیان بە یەک جۆر ئەلفابێی تایبەت نووسراون. هەردووکیان دیار نین کێ نووسیونی. کوردۆییف دەڵێ: شێخ ئادێ (دەوروبەری ١٠٧٥- ١١٦٠) لە هەکاری نووسیونی.

## ١١٧٦ ز

(احمد بن يوسف الارزق الفارقي) (١١١٧- ١١٨١)، لەدایکبووی (میافارقین) یەکەمین مێژوونووسی کوردە کە بە زمانی عەرەبی مێژووی دەوڵەتێکی کوردیی نووسیبێتەوە: (تاريخ الفارقي)، کە برێتییە لە رووداوەکانی دەوڵەتی دۆستەکی کە پایتەختیان لە (میافارقین) نێزیک دیاربەکر بووە. دیاربەکر و بەتلیس و نوسەیبین و وان و ئەلعەزیزە لەژێر دەسەلاتی میرانی ئەو دەوڵەتە کوردییەدا بوونە، کە عەرەب پێی دەڵێن (الدولة المروانية) و تەمەنی دەوڵەتەکەش (١٠٤) ساڵ بووە.

## ١١٨٠

گەڕاڵی ئیسپانی، پەتاهیا دوراتیسبۆن Petahia de Ra-tisbonne لە سەردەمی خەلیفە الناصر (١١٨٠ _ ١٢٢٥) هاتۆتە هەولێر و کەرکووک، لە سەفەرنامەکەیدا باسیان دەکات.

## ١١٨٧

- کۆنترین میناتۆری کوردی: فرمانێکی سەلاحەدین ئەیووبی و تێیدا ئازادیی ئەرمەنییەکان لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتەکەیدا مسۆگەر دەکات.

- دوو نیگارکێشی ناودار، دوو مامۆستای میناتۆر لە

مەڵبەندی جەزیرە و دیاربەکر: (مهران منصور) کوڕی (مهران)؛ لەگەڵ (بدیع الزمان اسماعیل) (ابن الرزاز) الجزری (الجزیري).

- حصن الاکراد Le Craque de Chevaliers لە نێوان بەعلەبەگ و حەمەس لەسەر گردێک دروست کراوە، بورجێکی لەسەرە، عەرەبە شۆڤینییەکانی سووریا ناوەکەیان کردووەتە (قلعة الحصن). میرەکانی شام (بەتایبەتی ئەوانەی سەردەمی سەلاحەدین ئەیووبی) کوردەکانیان لەوێ دانابوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوە دژی خاچپەرستەکان. هێدی هێدی، گەورەتریان کرد و پتەوتریان کرد تا ڕادەی ئەوەی کە بووە قەڵایەکی پڕ لە چەک و نازووقەی شەڕ دژی خاچپەرستەکان. نموونەیەکی بەرچاوی ئارشیتێکتووری کورد نیشان دەدا. (ابن جبیر) باسی کردووە.

## ١١٩٠

شاعیرێکی جوولەکەی ئیسپانی Yehuda al - Harizi لە ساڵانی ١١٩٠دا، دێتە هەولێر و لە کتێبەکەیدا کە لە ١٨٨٣ لە Gottingen چاپ کراوە باسی دەکات و ناوی هەموو ئەو شاعیر و شەخسیاتانەش دەهێنێ کە لەو سەردەمەدا لە هەولێر ژیاون.

## ١٢٠٥

زانا و ئەستێرەناس و نیگارکێش و ئەستێرەناسی کورد، (ابن الرزاز بدیع الزمان الجزري) (الجزیري)، کە کوردی دیاربەکر و مەڵبەندی جەزیرە بووە، کتێبێک بە عەرەبی لەبارەی زانستی فیزیا و ئەندازیاریی میکانیک دەنووسێ بەناوی (الجامع بین العلم و العمل النافع في صناعة الحیل) کە دەیان نیگار و میناتۆریشی لەخۆ گرتووە کە بە یەکێک لە یەکەمین تابلۆ و میناتۆرە کوردییەکان دەژمێردرێن.

## ١٢١٧

- نیزامی گەنجەوی (؟- ١٢١٧ز) کە دایکی کورد بووە، لە شیرین و خوسرەوەکەیدا ناوی سی (٣٠) لە مەقام و ئاوازە کوردییەکانی بردووە.

- شمس قیس رازی (١٢١٧ ز) لە (المعجم في معاییر



یەکەم میناتۆری کوردی

فەرمانێکی سەلاحەدین ئەیووبی لەبارەی ئەرمەنییەکان

اشعار العجم) له باسکردنی مۆسیقای کوردیدا ئاوازێکی شی کردووەتەوە ناوی (هەورەمان)ە.

۱۲۲۰

مـوزەفـەرەدین گـۆکـبـەری (سـوڵتـان مظفـر) نوێنەری سـەلاحـەدینی ئەیووبی لە هـەولێـر ( کـە لە ۱۲۳۳ کـۆچی دوایی دەکات و ماوەی فەرمانڕەواتییەکەی لە هەولێر بریتی بووە لە ۱۲۲۸ - ۱۲۳۳)، دوای ئەوەی لە قودس یادکردنەوەی مەسیح و ئاهەنگەکانی مـەسیحـیـیـەکان دەبینێ؛ کاتێ لە شـەڕی قـودس دەگـەڕێتـەوە هـەولێـر، لە سـاڵی (۱۲۲۰) بۆ یەکەم جار لە مێژووی هـەمـوو وڵاتانی عـەرەب و ئیسلامدا یادکردنەوەی ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەر دەکاتە نەریتێک: لە هەولێر و لە سەرتاپای جیهانی ئیسلامدا هەر لە مانگی سەفـەرەوە تا سـەرەتای (ربیع الاول) بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمـبەر ئاهەنگ ساز دەکەن؛ مۆسیقا و گۆرانی دەچڕن. چەندان هـەزار درهـەمی زێڕی دەدایە هەرچی مـەلایەک لە ئەفریقیا، لە ئاسیا مـەولوودنامەی بنووسیایە. بەم شێوەیە مەولوودنامـە دەبێتـە ژانرێکی ئەدەبی و سـازدانی ئاهـەنگ و مۆسیقا و گۆرانییەکانیش، بێگومان، کاریگەرییەکی بەزەبر دەنوێنن بەسـەر پەرەسـەندنی مۆسیقا و مـەقـامات و گۆرانی لە وڵاتـانی عـەرەب و ئیسـلامـدا، کـە قـۆریاتی تورکـمـانیش پاشان لەمەوە سەرهەڵدەدا.

لەژێر کـاریگـەریی ئەم بـایەخـدانەی سـوڵتـان مـزەفـەر بە ئاهەنگی مـەلودنامـە و مـەقـامـات، یەکێک لە یەکـەمین ئەو مۆسیقاناس و نووسـەرانەی کە باسی لە مەقامات و ئاواز و گـۆرانی کـردبێت لە سـەردەمی دوای عـەباسـیـیـەکاندا، لە سـاڵی ۱۳۲۸؛ (بدرالـدین الاربیللي) (۱۲۸۷- ۱۳٥٤)، شـاعـیـرێکی کـوردی هەولێری بووە و لە بەغدا نێژراوە، کتێبێک لەبارەی ئاواز و گۆرانی و مـەقامەکان بە ناونیشانی (ارجوزة الانغام) بە زمانی عەرەبی دەنووسێ.

۱۲۲٤

- چەندان شـاعـیـری کـورد لە هەولێـر بە زمـانی ئارامی - سـریانی بە ئەلفـابێی سـریانی، شـیـعـریان نووسـیـوە. (کۆرگیس وەردە) کە شاعیرێکی هەولێرییە و لە هەولێر لە



شێخ ناسر

## ١٢٣٣

موزەفەرەدین گۆگبەری، نوێنەری سەلاحەدینی ئەیووبی لە هەولێر، کۆچی دوایی کرد و ئیبن مستەوفی وازی لە وەزارەت هێنا.

## ١٢٣٧

### سەردەمی مەنگۆلەکان

- مەغۆلەکان هەولێر داگیر دەکەن و ئیبن مستۆفی دەچێتە مووسڵ.

- مەنگۆلەکان لەژێر فەرمانڕەوای هۆلاکۆدا. لە ساڵی ١٢٤٢ بنەماڵەی سەلجووقییەکانیان لەناو برد و دەسەڵاتیان - لە جیاتی ئەوان- گرتە دەست.

هۆلاکۆی مەنگۆلی لە ١٢٥٢ گەیشتە بەغدا و ئەوێشی داگیر کرد؛ لە ١٢٥٨ دوایین خەلیفەی عەباسییەکانی کوشت؛ ئیتر وردە وردە کوردستانی گەورە (بەشی عێراق و ئێران و تورکیای ئەمڕۆ) هەر هەمووی کەوتە ژێر فەرمانڕەوای بنەماڵەی مەنگۆلەکان.

مێژوونوسی ئینگلیز Le STRANGE پەنجەنومای دەکات: (لە سەردەمی مەنگۆلەکاندا، سەرەڕای وێرانکاری و قەتڵوعامی کورد لەلایەن مەنگۆلەکانەوە بەڵام ئوستانی «کوردستان» وەک ئوستانێکی ئیداری لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی مەنگۆلیدا ناوی هەر مابوو؛ نەخشە «جوگرافیە» ناوەخۆییەکەی نەسرابووەوە، هێندە نەبێ کە لەو سەردەمەدا پایتەختی ئوستانی «کوردستان» کە جاران شاری (بەهار) بوو گوێزرایەوە شاری (سوڵتان ئاباد) .

## ١٣٠٠ - ١٣٢٦

بنیاتنانی دەوڵەتی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ. لە سەرەتادا تەنیا ئەستەمبوڵ و دەوروبەری لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی تورکە عوسمانییەکاندایە، پاشان وردە وردە بەرەو کوردستان دێن و داگیری دەکەن.

## ١٣١٨

(رشيد الدين فضل الله الهمذاني) لە (جامع التواريخ) لە



سەدەی سێزدەدا لەدایک بووە. گرینگترین بەرهەمەکانی ئەو شیعرانەن کە لەبارەی هێرشەکانی مەغۆلی بۆ سەر هەولێر لە ساڵانی ١٢٢٤، ١٢٢٨، ١٢٣٥ نووسیونی کە چۆن هەولێریان سووتاندووە و کاولیان کردووە. ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، هیلگینفێلد، دە دانە لەو شیعرانەی بە تەرجەمەی ئەڵمانییەوە لە لایبسک لە ١٩٠٤ دا بڵاو کردووەتەوە. هەروەها چەندان شاعیری تری وەک خامیس بەر قەرەداحی.

- (ابن الشعار الموصلي) لە (قلائد الجمان، ل ١٩٣) باس لەوە دەکا کە لە هەولێر ژمارەیەکی بەرچاو داوودەزگای فێرکردن و پەروەردە هەبووە. (ابن خلكان) لە (وفيات الاعنان) دەڵێ کە یەکەم قوتابخانە لە هەولێر لە ساڵی (١١٢٧) دەرگەکانی خرایە سەر پشت. (ابن المستوفي) لە (تاريخ اربل، ل ١٥٨) دەڵێ کە زۆربەی قوتابییەکانی ئەو قوتابخانەیە کورد بوونە، بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەش بەڵگەی ئەوەمان بەدەستەوە هەیە کە دەبینین یەکێک لە مامۆستاکانی ئەو قوتابخانەیە تەرجومانێکی لەگەڵدا بووە بەناوی (ابوبكر بن عبدالله ابي بكر المهاني ١٢٣٠). (ابن المستوفي) دەڵێ: «تەرجومانەکە یارمەتیی مامۆستاکەی دەدا لە وەرگێڕانی قسە کوردییەکانی قوتابییەکان بۆ مامۆستاکە... هتد).

سوڵتان مزەفەر بیمارستان و ددانسازی و دەرمانخانە و تەمبەڵخانە و هەتیوخانەیشی دروست کردبوو. ابن خلكان باسی دەکا.

## ١٢٧٠- ١٢٩٠

جوگرافیاناسی ناوداری ئیتاڵی، مارکۆ پۆلۆ (١٢٥٤ ـ ١٣٢٤) گەشتە ناودارەکەی بەرەو کوردستان دەکات و سەفەرنامەکەیشی لە کۆتایی ساڵانی ١٢٩٠دا دەنووسێتەوە: وشەی (کوردستان)ی بەکار هێناوە.

- مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی (١٢٠٧- ١٢٧٣)، شەش جار زیاتر لە (كليات شمس تبريزي) ناوی (کورد)ی هێناوە.

## ١٢٨٣

ڕاهیبی دۆمینیکیی ئیتاڵی Ricoldo da Montecrotce

(١٣١٨) چەندان جار وشەی (کوردستان)ی بەکار هێناوە. هەروەها (حمدالله المستوفي القزويني) لە (١٣٤٩) لە کتێبی (نزهة القلوب) ناوی (کوردستان)ی هێناوە.

## ١٣٣٦-١٤٠٥

دووەمین ئیمپراتۆری مەنگۆلی لەژێر فەرمانڕەوایەتی تەیمووری لەنگدا:

لە سەردەمی تەیموورلەنگدا، وەک لە (ظفرنامە)دا باسی لێ کراوە، میرنشینێکی بەهێزی کورد، لەژێر فەرمانڕەوای (ئیبراهیم خانی بەتلیسی)دا لە ئارادابووە. هەروەها لە ماوەی سالآنی ١٢٩٧-١٣١٠دا چەندان راپەڕینی خوێناوی و بە هێزی کورد دژی فەرمانڕەوای مەنگۆل بەرپا بووە.

## ١٣٦٠

(ابن بطوطة) لە ١٣٧٧ مردووە، باسی ئەوە دەکا کە لەو سەردەمەدا شارەکانی مووسڵ و ماردین و سنجار چەند شارێکی کوردنشین بوونە.

## ١٣٩٠

(ابن خلدون) (١٣٣٢ـ ١٤٠٦) لە (کتاب العبر، ب ٢، ل ٤١٣ و ٤٦١) باسی ئەوە دەکا کاتێ هێزی مەغۆل کوردەکانیان تالآن کرد و کوشتنیان، هەندێ لە هۆزە کوردەکان ناچاربوون بەرەو سووریا و میسر و جەزائیر کۆچ بکەن.



(فلۆرەنسا ١٢٤٣ـ ١٣٢١) هاتووەتە ئەرمینیا و تورۆس و بەغدا و مووسڵ، بە چیاکانی ڕەواندزیشدا تێپەڕ بووە و هاتووەتە شەقلآوە، هەندێ دەنگوباسی لەبارەی کورد و کوردستان لە کتێبەکەیدا بلاو کردووەتەوە. باسی گارزۆنی و گەلێک قەلآی کوردستان دەکا کە ئەورووپی دروستیان کردوون.

## ١٢٨٧

جوگرافیاناسی چینی، رابان ساوما Rabban SAUMA لە سالآنی ١٢٨٧ـ ١٢٩٠دا لە شاری پەکینەوە بە ڕێگەی سەمەرقەندەوە هاتووەتە تەورێز پاشان بە کوردستانی ئێران و تورکیای ئەمڕۆدا تێپەڕیوە تا گەیشتووەتە دەریای رەش، سەفەرنامەیەکی بایەخداری هەیە.

## ١٢٨٨

یەکەمین گرووپی موژدەگارە مەسیحییەکان، بە سەرۆکایەتیی Aorentin RICOLDO، لە ١٢٨٨دا بوو گەیشتنە شاری تەورێز، پاشان بە ناوچەرگەی کوردستاندا چوونە شاری مووسڵ.

## ١٣٢٨

- هونەری مەقامات و قۆریات لە هەولێر هەبووە. (بدرالدين الاربيللي) (ئەبو مەعالی بەدرەدین کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی (احمد الاربيللي)، شاعیرێکی هەولێری بووە و لە بەغدا نێژراوە (١٢٨٧- ١٣٥٤)، کتێبێک لەبارەی مەقامەکانی ناو هەولێر بە ناونیشانی (ارجوزة الانغام) بە عەرەبی دەنووسێ، لە مەقامەکانی ناو هەولێر دواوە.

بەشێکی کتێبەکەی، بە شیعر نووسیوە کە بریتییە لە (١٠١) بەیت بە زمانی عەرەبی. مەقامە بنچینەییەکانی دەسنیشان کردووە و دەڵێ:

و اعلم بان الرست اصل الكل
عنه تفرعت بحكم العقل

ئنجا سێ مەقامی تریش (زۆرکەند و عێراق و ئەسپەهان) بە بنچینەیی دادەنێت و پێی وایە کە هەموو مەقامەکانی تر لەم چوار مەقامەوە دروست بوونە و ژمارەیان دەگاتە (١٢)



زانایەکی کوردی سووریا
میناتۆرێکی کوردستانی سووریا (سەدەی ١٨)



مەقام.

- جەلالەدین کوڕی عومەر خدری داسنێی کوردی (١٣٩٧؟) کتێبێکی بە زمانی عەرەبی لەبارەی مۆسیقا نووسیوە بە ناونیشانی (الكنز المطلوب في علم الدوائر و الظروب)، لەوێدا باسی گۆرانی و مۆسیقای کوردی دەکا.

### ١٣٤٢

- کتێبی پیرۆزی مەسحەفا ڕەشی یەزیدییەکان.

- شێخ عیسا بەرزنجی (١٢٨٣ ـ ١٣٥٣) بە کوردی شیعری نووسیوە.

### ١٣٥٦- ١٤٢١

- مەلا پەرێشان بە دیالێکتی گۆران شیعر دەنووسێ.

### ١٣٧٤

(الامام النواوي: الاذكار - للامام النواوي)، دەسنووسێکە بە زمانی عەرەبی، (خضر بن عمر الكويسنجقلي) نووسیویەتیەوە، لە کتێبخانەی جەلیزادان، واتە لە کتێبخانەی (مەلای گەورەی کۆیە) واتە باوکی مەسعوود محەمەد لە کۆیە پارێزراوە؛ دەسنووسەکە لەبارەی گۆرانی و مۆسیقای کوردی و مەقامەکانی ڕۆهەڵات دەدوێ، هەروەها باسی چەندان مۆسیقاژەنی پایەداری ساڵانی (١٢٠٠ تا ١٣٧٤) دەکات، لەوانە مۆسیقاژەنی ناوداری ئەو زەمانە: (الجمال المشرقي - خضر بن عمر) کە هەر خۆیشی کتێبە دەسنووسە عەرەبیەکەی، بەخەتی خۆی نووسیوەتەوە. شایانی باسە، دوکتۆر مستەفا جەواد کە مۆسیقاناس و ڕووناکبیرێکی گەورەی هونەرمەندی بەغدایییە، لە ساڵانی حەفتاکان لە ڕۆژنامەی (الثورة) لە وتارێکیدا لەبارەی مەقاماتی عێراقی، ئەم کتێبە و نووسەرە کوردەکەی، زۆر بەرز نرخاندووە. ئەم دەسنووسە شایانی ئەوەیە دوکتۆرای مۆسیقای پێ وەربگیرێت و تەرجەمەی کوردی بکرێ.



قەلای کوردان، لە سووریا



مۆسیقای کوردی لە ساڵانی ١٧٠٠



کورد، له کاتی شەڕ، مۆسیقا: (سالآنی ۱۸۰۰)



قەووالە یەزیدییەکان، سالآنی ۱۸۰۰

دەروازەی دووەم

# کرنۆلۆجیای کوردستان

## لە ١٥١٤ تا ١٨٩٨



کورد و مۆسیقا، ئەدمۆنز: ١٩٥٦

## ساڵانی ١٤٠٠

### ١٤٣٥

**قەرە قۆینلوو**

بنەماڵەیەکی تورکمانی شیعەگەر بەناوی قەرە قۆینلوو «مەڕی ڕەش» کە ماوەیەکی زۆر بوو لە مەڵبەندەکانی ئەنادۆڵی ئاسیای بچووکدا گەیتشبوونە پلەی دەسەڵات، لە ساڵی ١٤٣٥دا باشووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان (واتە کوردستانی عێراق و ئێرانی ئەمڕۆ) داگیر دەکەن. هەر لەو سەردەمەدا کە کوردەکانی موکریان زنجیرەیەک ڕاپەرینی شێرانە دژ بەم بنەماڵە تورکمانە شیعەگەرە بەرپا دەکەن لەپێناو پاراستنی دەسەڵاتی نەتەوەیی خۆیان لە ناوچەی باشووری گۆمی (ورمێ)دا .

### ١٤٧٠

**ئاق قۆینلوو**

بنەماڵەیەکی تری تورکمان بەناوی ئاق قۆینلوو «مەڕی سپی»ـ کە بەپێچەوانەی «قەرەقۆینلوو» سوننی مەزهەب و سوننەگەربوون لە ساڵی ١٤٧٠دا لە سەرەتادا ناوچەی هەکارییان داگیر کرد، پاشان تەواوی مەڵبەند و ناوچەکانی بۆتانیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیان و شاری دیاربەکریشیان کردە پایتەختی خۆیان. سەرتاپای ئوستانی جەزیرە و مەڵبەندی بۆتان کەوتنە ژێر دەسەڵاتیانەوە.

### ١٤٩٨

بەپێی سەرژمێرییەک لە ساڵی ١٤٩٨ کراوە، تەنیا لە سێ گوندی دەوروبەری ئەستەمبوڵدا (٣٨٢) کورد ژیاون.



## ساڵانی ١٤٠٠

- نوێژە مەسیحییەکەی تۆماس مێتسۆب (١٤٠٠).

کوردناسی فەرەنسی، تۆما بوا، دەڵێ: لە ساڵی ١٩٣٧دا، پرۆفیسۆر عەبدولآزادە لە ئارشیفخانەیەکی کۆنی ئەرمەنییەکاندا لە شاری ئێتشمیازین Etchmiadzin بە خەتی مێژوونووسی ئەرمەنی، تۆماس مێتسۆپ T. MET-SOP (کە لە ١٤٤٦دا مردووە) دەسنووسێکی دۆزییەوە کە لە ساڵانی ١٤٠٠دا نووسراوە و چەندان ئەلفابێی جۆراوجۆری تێدایە.. هەروەها چەند نوێژێکی مەسیحییەکانی تێدایە بە حەوت زمانی جیاواز، لەوانە بە زمانی کوردیش.

Thomas BOIS: Bulletin Raisonne d Etudes Kurdes.- Imprimerie Catholique, Beyrouth: 1964. P. 551.

- لە ژمارەیەک دەسنووسی ئەرمەنیدا چەند دێڕێکی کوردی بە ئەلفوبێی ئەرمەنی نووسراوە. یەکێک لەو دەسنووسانە لەبارەی ڕێزمانی ئەرمەنییە و لە سەدەی پازدەدا نووسراوەتەوە، بەڵام چەند دوعایەکی بە عەرەبی و فارسی و کوردی تێدایە.
- مەولوودنامەکەی مەلای باتێ (١٤١٧- ١٤٩٥)، کە تۆژەران ڕایان وایە کۆنترین مەولوودنامەیە نووسرابێ. ئەم مەولوودنامەیە، کە بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو و مێژووی نووسینی دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی ساڵانی (١٤٠٠)، بەپێچەوانەی مەولوودنامەکانی تری سەدەی نۆزدەم، هەمووی بە شیعر نووسراوە.

### ١٤٦٠- ١٤٧٠

- مۆسیقاژەنی ناوداری کورد، عەبدولقادر مەراغەیی (١٣٥٤ - ١٤٣٤ یان ١٤١٩؟)، کتێبێکی بە ناونیشانی (جامع الالحان) نووسیوە، لەوێدا باسی گۆرانی و ئامێرەکانی مۆسیقای کوردی دەکا.

### ١٤٤٢

شەهابەدین ئەحمەد (١٤١٠- ١٤٨١) ناسراو بە (مەلا گۆرانی) کە لە شارەزوور لەدایک بووە، لەسەر داوای سوڵتان موورادی دووەم، ساڵی (١٤٤١) دێتە ئەنادۆڵ و

ساڵی (١٤٤٢) لە مەدرەسەکانی شاری بورسە دەست بە دەرسدانەوە دەکا، ساڵی (١٤٤٣) دەبێتە مامۆستای سوڵتان محەمەدی فاتیح لە ئەستەمبوڵ لە ناوچەی (مانیسە). ئنجا پاشان لە ساڵی (١٤٨٠) لە ئەستەمبوڵ، ئەم زانا کوردە کراوەتە (شیخ الاسلام) تا کۆچی دوایکردنی لە (١٤٨٨).

– ئیدریسی بدلیسی (١٤٥٢- ١٥٢٠)، بەشێک لە کتێبەکانی لەبارەی پزیشک و گیانەوەرناسی و گەردوونناسی، بە فارسی و ئەوانی تریشی بە تورکی نووسیون. (رسالة في اباحة الاغاني) بە فارسی نووسیوە.

### ١٤٤٦

بووژانەوەیەکی ئەدەبی بە دیالێکتی گۆران لە سای میرنشینی ئەردەڵانەکاندا: شاوەیس قولی (١٤٠٧-١٤٨٢)، عالی قەڵەندەر (١٤٣٤-١٥١٢). هەروەها مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لە بنەماڵەی زانیاران (ل ١١٨) دەڵێ کە مەلا گوشایش ئیسلامەتیی لە هەوراماندا بڵاو کردووتەوە.

### ١٤٧٣

بڵاوکردنەوەی گەشتنامەکەی زێڕنگەری باڤاری (ژۆهان سچیل بەرگەر) کە تێیدا باسی کوردستان دەکات و وەسفی گەلی کورد دەکات.

– مەولانا جامی لە ١٤٧٣ بە هەولێردا تێپەڕیوە.

### ١٤٩٢

بەنابەرە جوولەکە ئیسپانییەکان کاتێ کۆچیان کرد بەرەو تورکیا، دەزگای چاپیان لەگەڵ خۆیان بردە تورکیا، سوڵتانی عوسمانی مۆڵەتی چاپی کتێبی پێیان دا بەڵام بەمەرجێک کتێبەکان بە ئەلف و بێی عەرەبی نەنووسرێن. دواتریش ئەم مۆڵەتە بە کەمینە مەسیحییەکانیش درا، هەتا سەدەی هەژدەم لە سەرانسەری حوکمڕانیی عوسمانیدا کتێب بە خەتی عیبری، یۆنانی، ئەرمەنی، سریانی و هەندێک جاریش لاتینی چاپ دەکرا.. بەڵام نەک بەو خەتە عەرەبییەی کە عوسمانی و موسڵمانەکان کەڵکیان لێ وەردەگرت.



کورد لەناو لەشکری عوسمانیدا، ساڵانی ١٨٠٠

# سالآنی ١٥٠٠



دوو کوردی ئەنادۆڵ

## سەدەی شازدەم
## سەفەوییەکان لە رۆهەڵات و
## عوسمانییەکان لە رۆئاوا

### ١٥٠٢

شا ئیسماعیل (یەکەمی) ئێران دەسەڵات دەگرێتە دەست و دەوڵەتی سەفەوی، بەناوی بنەماڵەکەیەوە لە ئێران دادەمەزرێنێ، کوردستانی ئەمرۆی ئێران و عێراق، هەروەها بەشێکی کوردستانی تورکیاش (تاکو شاری مەرەش) داگیر دەکات.

### ١٥١٢

عوسمانییەکان، کە تازە خەریکە دەسەڵاتیان لە ئەستەمبۆڵەوە بەرەو کوردستان نێزیک دەبێتەوە، دەیانەوێ کوردستانی ئەمرۆی تورکیا بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

### ١٥١٤

شەڕی چاڵدێران، لەنێوان شا ئیسماعیلی سەفەوی ئێران و سوڵتان سەلیمی عوسمانیدا، لەو شەڕەدا (ئەمیرخانی بەتلیسی) پشتی سوڵتان سەلیمی عوسمانی دەگرێ دژ بە شا ئیسماعیلی سەفەوی: ئەمە دەبێتە هۆی تێکشکانی شا ئیسماعیلی سەفەوی، لە پاداشتی ئەمەشدا سوڵتان سەلیمی عوسمانی دان بە سەربەخۆیی میرنشینی (ئەمیرخانی بەتلیس) دەنێ و پەیمانی دەداتێ کە دەست نەخاتە ناو کاروباری ناوخۆی ئەم میرنشینە کوردییەی ئەمیرخانەوە.

– بە فەرمانی سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٨) میرنشین لە ناوچە کوردنشینەکاندا پێک هاتن کە هەموویان ملکەچی ئەستەمبوڵ بوون. لە هەمان کاتدا زۆربەی میرنشینە یاخییەکانی وەک (ئازیزان) و (حەسەنکێف) و (شێروان) رووخێندران.



## سەدەی شازدەم
## سەفەوییەکان لە رۆهەڵات و
## عوسمانییەکان لە رۆئاوا

### ١٥٠٠

لە دەوروبەری ١٥٠٠دا، لە دەوروپشتی کێوی شنروێ لە نزیک هەڵەبجە، پەخشانەکانی (سروودی یارسان) سەرهەڵدەدەن کە تێکەڵەیەکی پەخشان و شیعرن بە زارێکی تێکەڵی هەورامی – لەک – کرماشانی و پێیان دەگوترێ «دەفتەر»، ناودارترینیان برێتییە لە «سەرەنجام»: قسەکانیش پێیان دەگوترێ «کەلام». زۆربەی بۆچوون لەسەر ئەوە رێکن کە سوڵتان ئیسحاق نووسیونی و ئیمامی عەلی بە رەمزی خوا دەزانێ: بۆیەش بە پەیڕەوکارانی گوتراوە «عەلی ئیلاهی»، بە مەزهەبەکەشیان دەگوترێ «ئەهلی حەق».

– ئێل بەگی جاف ١٤٩٢– ١٥٥٣ بە دیالێکتی گۆران شیعر دەنووسێ.

### ١٥١٤

کوردستان لە ١٥١٤ بەملاوە دابەش کراوەتە سەر دوو ئیمپراتۆریەتی فارس (صەفەوی) و تورک (عوسمانی)

### ١٥٢٠

لەدایکبوونی سەیدەی هەورامی

### ١٥٣٠

بەرهەمەکانی عەلی هەریری. (هەندێک رایان وایە کە عەلی هەریری لە دەوروبەری (١٤٤٠) لەدایک بووە).

### ١٥٣٤_١٥٣٦

گەڕیدەی عوسمانی، ناسح مەترەقچی بە کوردستاندا گەڕاوە، لە (سولەیماننامە)دا باسی کوردستانی کردووە، کە لە ١٥٤٥دا لەگەڵ کۆمەڵێک میناتۆری کوردیدا بڵاو کراوەتەوە.

## ژیانی سیاسی

### ١٥١٥/٨/٩

مۆرکردنی پەیمانی میرنشینە کوردییەکان و سوڵتان، بە هاوکاریی مەلا ئیدریسی بەتلیسی کە لایەنگیری عوسمانییەکان بوو.

### ١٥٤٨- ١٥٤٩

داگیرکردنی بەشێکی ڕۆهەڵاتی کوردستان لەلایەن سوڵتان سلێمانی عوسمانییەوە. ئنجا هێرشکردنە سەر ڕواندز.

### ١٥٥٣

لەشکری عوسمانییەکان شارەزوور و بانە داگیر دەکەن.

### ١٥٥٩/٩/٧

عوسمانییەکان میری سۆران (میر سەیفەدین) لەسێدارە دەدەن.

### ١٥٦١

میرنشینی ئەردەڵانەکان، کە بارەگایان لە ساڵی (١١٦٨) لە قەڵای زەڵم بوو، لە ساڵی ١٥٦١ چوونە قەڵای مەریوان، ئنجا چوونە قەڵای پڵنگان.

### ١٥٨٠

تەیموورخان، بە هاوکاریی عوسمانییەکان میرنشینی ئەردەڵانی گرتە دەست.

### ١٥٨٦

دروستکرانی پردی ئاڵتوون کۆپری لەلایەن سوڵتان مورادی سێیەم بۆ هێرشبردنە سەر ئێران.

### ١٥٩٠/٣/٢١

لوڕستان و شارەزوور، بەپێی پەیمانێک لە نێوان سەفەوی و عوسمانیدا لە ئەستەمبوڵ، کەوتە دەست عوسمانییەکان.

## ژیانی کولتووری

### ١٥٤٥

ئەبوسوعوود ئەفەندی (١٤٩١- ١٥٧٥) یەکێکە لەو کوردانەی ئەستەمبوڵ کە ساڵانێکی زۆر لە سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانوونی و سوڵتان سەلیمی دووەمدا شەیخولئیسلامیی کردووە لە ئەستەمبوڵ. ناوبراو لە گوندی مودەڕیس لە لە دەوروبەری ئەستەمبوڵ لەدایک بووە، کوڕی زاتێکە بە ناوی شێخ موحێدین مستەفا، بنەماڵەکەیان لە ئامێدییەوە هاتوونەتە ئەستەمبوڵ، بۆیە بە ئەبوسوعوود عەمادییەوە ناسراوە. ئەبوسوعوود ئەفەندی لە مەدرەسەکانی داود پاشا و مەحموود پاشا کاری کردووە. پاشان دەبێتە قازی، ئنجا لە (١٥٤٥) بە (شیخ الاسلام) دادەمەزرێ.

- مەلا ئیدریسی بەتلیسی (١٤٥٢- ١٥٢٠) پیاوماقووڵێکی تری ناسراوی کورد بووە کە خزمەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی زۆر کردووە. خاوەن بیست کتێبە بە زمانی عوسمانی، لەوانە (سەلیمنامە) و (شاهەنشای قانوونی) کە دوکتۆرای لەسەر وەرگیراوە. لەسەر داخوازیی سوڵتان بایەزیدی دووەم (١٤١٨- ١٥١٢) بۆ نووسینی مێژووی عوسمانی، کتێبی (هەشت بەهەشت) دەنووسێ و ناوبانگێکی گەورە پەیدا دەکا. دواتر سوڵتان سەلیم (١٤٦٧- ١٥٢٠) نزیکی خۆی دەخاتەوە.

### ١٥٥٧

سەیدی عەلی رەئیس دەفتەرداری دیاربەکر؛ لە ١٥٥٣- ١٥٥٧ لە گەشتنامەکەیدا بە عوسمانی، باسی سەرتاپای کوردستانی کردووە.

### ١٥٦٣- ١٦٤١

فەقێی تەیران. شیعر بە دیالێکتی کرمانجی ژووروو

### ١٥٦٧- ١٦٤٠

مەلای جزیری، کە یەکەم شاعیری کوردە، وشەی (کوردستان)ی لە شیعرەکانی خۆیدا بەکار هێنابێت.

**١٥٧٧**

بیرەوەرییەکانی مەئموون بەگ، ڕاپۆرتێکە بە زمانی تورکیی عوسمانلی، کە مەئموون بەگی بێگە بەگ لە سەرەتای مانگی کولانی (١٥٧٧) لە ماوەی زیندانکرانیدا لە حیللە کە ١٢ ساڵێک تێیدا ماوەتەوە، لە شێوەی سکاڵانامە بۆ سوڵتان موڕادی عوسمانی نووسیوە. بیست ساڵ پێش (شەرەفنامە) نووسراوە. ئەمڕۆ بە بەڵگەنامەیەکی گرینگ دژمێردرێ لەبارەی مێژووی کوردستانی ساڵانی (١٥٠٠) بەتایبەتی لەبارەی مێژووی میرانی ئەردەڵان.

**١٥٨٧ - ١٥٨٦**

سەلیمی سلێمان، شاعیری کوردستانی تورکیا: داستانەشیعری یووسف و زلێخا.

**١٥٩١**

عەلی تەرەماخی لە ١٥٩١ بەدواوە هەڵکەوتووە. (قەواعیدی عەرەبی)ی بەزمانی کوردی نووسیوەتەوە.

**١٥٩٧_١٥٩١**

میر شەرەفخانی بەتلیسی (١٥٤٣ _ ١٦٠٦) لە ١٥٩١ دەست دەکات بە نووسینی کتێبی (شەرەفنامە) کە لە ١٥٩٧/٨/٤ لە نووسینی تەواو دەبێ. بیست میناتۆر بۆ کتێبەکەی دروست دەکات کە دەبن بە گەنجینەیەک بۆ مێژووی هونەری نیگار لە کوردستاندا.

لەنێو میناتورەکانی ژمارە (١) و (٦) و (٩)دا وێنەی چەند ئامێرێکی مۆسیقایی کێشراون، لەوانە: بووق و کەڕەنا و تەمبوور یان ساز. ئەم دیاردەیە دەیسەلێنێ کە لە چوارچێوەی میرنشینی بەتلیسدا لە دیوەخانی شەرەفخاندا بەشێوەیەکی گشتیش لە کوردستاندا مۆسیقا خولیایەک و گۆرانی هونەرێکی بەرەواج بووە.

میناتۆرەکانی شەرەفنامە لە هەموو ڕوویەکی ئەتنۆگرافی و ئەدەبی و شێوەکاری و کۆمەڵناسی و دینی و ئێستاتیکا و مێژووییەوە بایەخی خۆیان هەیە.

شەرەفخان لە قوتابخانەی شادا فێری ڕێوشوێنی وێنەکێشی بووە. قەڵەمەکەی خۆیی چواندووە بە قەڵەمی



کەریمخانی زەند

## ١٥٩٧

- میر شەرەفخانی بەتلیسی (١٥٤٣ ـ ١٦٠٦)، لە ١٥٩٧ میری میرنشینی بەتلیسە.

شەرەفخانی کوڕی شەمسەدین خانی بەتلیسی، لە تەمەنی نۆساڵیدا چووەتە قوتابخانەی شاتەهماسبی کوڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی کە تایبەت بووە بە کوڕانی گەورە پیاوان. لە پاڵ ئەوەی میری بەتلیس بووە، نیگارکێش و مێژوونووسێکی کارامەش بووە. شەرەفخان نووسیویە ئەو دەمەی لە قوتابخانەی شا بووە، شا تەهماسب کاتی سەردانیان گوتوویە جاروبار ئاگاتان لە سەنعاتی (نەقاشی) واتە هونەری وێنەکێشی بێ. ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لەو سێ ساڵەدا دەرسی وێنەکێشی خوێندووە. شاتەهماسب خۆیشی نەقاش بووە و باوکی ناردوویە بۆ قوتابخانەی نەقاشی لە شاری هەرات تا لەلای گەورە نەقاشانی قوتابخانەی نەقاشیی تەیمووری فێری نەقاشی ببێ.



دەمتێژ و بە لەنجەولاری (الواسطي).

- ئەدەبیاتی کوردی لەناو شار و حوجرەی مزگەوتەکاندا لەدایک بوو و لەنێو دیوەخانی ئەرستۆکراتە کوردەکاندا پەروەردە کرا. شاری بەتلیس نزیکەی ٥٠٠ زانا و قوتابی و شاگردی تا کۆتاییی سەدەی ١٦ پەروەردە کردووە. لە سەدەی ١٧مدا ٥ مزگەوتی گەورە، ٥ قوتابخانەی دینی، ٧٠ مەکتەب (قوتابخانەی سەرەتایی)، ١٩ تەکیە (ناوەندی دینی). ئەم داوودەزگایانە بە داهاتی زەوی و گوند و دووکان و گەرماوەکان بەڕێوە دەچوون. بەتلیس ٥ هەزار خانوو، قەڵایەکی ٣٠٠ خانوویی کە بۆ نزیکەی ٥٠٠ ٢٦ کەس دروست کرابوو. میری بەتلیس، عەبداڵ خان، نووسەر و مێژوونووس و فیزیکناس، کتێبخانەیەکی هەبوو کە چەندان هەزار کتێبی تێدا بوو، هەندێکیانی لە ئەورووپاوە لۆ هاتبوو.



شاری بازید، کۆشکەکەی ئیسحاق پاشا

# سالآنی ١٦٠٠




له قامووسی لارووسی فرەنسی وەرگیراوە

## ساڵانی ١٦٠٠

### ١٦٠٣

هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانی لەسەر دابەشکردنی کوردستان. شاعەباسی سەفەوی هێرشێک دەکاتە سەر کوردستانی تورکیا کە لە ٢٤/٨/١٦٠٥دا سەردەکەوێ.

### ٥/١٢/١٦٠٨

شەڕی قەڵای دمدم لە نێوان خانی لەپزێڕین و شا عەباسی سەفەویی ئێران. دوای مانگێک بەرگری قەڵای دمدم دەگیرێ. لە هەمان ساڵیشدا فەرمانڕەوایەتیی کوردیی ناوچەی برادۆست دەگیرێت. ناوچەی موکریان، لەلایەن شاعەباسەوە، دەدرێتە (شێربەگ)، کوردێکی داردەستی شاعەباس.

### ١٦٣٦

میرنشینی ئەردەڵانەکان کە بارەگایان لە ساڵی (١١٦٨) لە قەڵای زەڵم بوو، پاشان لە ١٥٦١ چوونە قەڵای مەریوان، ئنجا چوونە قەڵای پڵنگان و پاشان بۆ قەڵای حەسنە ئاوا – کە مەستوورە خانمی ئەردەڵانی لە مێژوونامەکەی خۆیدا باسی ئەو قەڵایەی بەفراوانی کردووە و هەروەها گەڕیدەی ئینگلیزیش، جان مالکۆڵم (١٧٦٩– ١٨٢٣) کە سێ جاران چووەتە سنە لە ساڵی (١٨٠٨) باسی قەڵای حەسەن ئاوای کردووە–؛ لە کۆتاییشدا ئەردەڵانەکان لە ساڵی ١٦٣٦ شاری سنە دادەمەزرێنن و بەیەکجاری لەوێ دەمێننەوە. بەم شێوەیە، شاری سنە تاکو ١٨٦٧ بووە پێتەختی ئەردەڵانەکان.

### ١٦٣٩

بەپێی پەیمانێک لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی سەفەویدا، ئێران شارەزووری لەدەست چوو. میرنشینی ئەردەڵانیش تەنیا ئەودیو زاگرۆسی بۆ مایەوە: بووە موڵکی بابان.



## ساڵانی ١٦٠٠

– مەلای جزیری (١٥٦٧– ١٦٤٠) ناوی ئەم نامێرە مۆسیقاییانە دەهێنێ کە لە کوردستاندا بەکار هاتوون: ڕوباب، چەنگ، نای، قانوون، ئەرگەنوون، دەف، هەروەها ناوی دەیان جۆر مەقام.

### ١٦١٤

پیەترۆ دیللا ڤاللا، ڕۆهەڵاتناسی ئیتاڵی لە ١٦١٤ لە بەرگی دووەم، ل ٨ چاپی ئیتاڵی باسی کوردستان و زمانی کوردی و ئێگزەنەفۆن و سەلاحەدینی ئەیووبی دەکا. لە باسی زمانی کوردیدا دەڵێ: " کوردەکان زمانی تایبەتی خۆیان هەیە و زمانەکەیان لە زمانی دراوسێ عەرەب و عەجەمەکانیان ناچێ ".

### ١٦٢٠؟

کتێبە ڕێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی (صرف و بعضی اصول لازمه یی تعلیمه بزمانی کورمانجیه) کە برێتییە لە ڕێزمانی عەرەبی بە زمانی کوردی (دیالێکتی کرمانجیی باکور)، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەمدا (١٦٠٠) نووسراوە. بەڵام مەلا مەحموودی بایەزیدی ئەم کتێبەی سەرلەنوێ لە ساڵی ١٨٥٧دا نووسیوەتەوە.

### ١٦٣٢

کوردناسی فەرەنسی، ژان باپتیست تاڤێرنیێ Jean- Baptiste TAVERNIER لە ١٦٣٢ هاتووەتە کوردستان. سەفەرنامەکەی بە ناونیشانی Les six voyages en Perse، لە ساڵی ١٦٧٦– ١٦٧٨ لە سویسرا چاپ کراوە. زیاتر لە هەشتا لاپەڕەی تەرخان کردووە بۆ کوردستانی ساڵانی ١٦٣٠. لە ب ٢، ل ٢٨، دەڵێ: «ئەو وڵاتەی لە هەموو وڵاتێکی تر بە هێزتر و سەرنجڕاکێشترە. لەبەرئەوەی نە سەر بۆ سوڵتانی عوسمانی دادەنوێنێ. نە پاشای فارسەکانیش بەهیچ دەزانێ. ئەمە لە کاتێکدا هەموو میرەکانی تر، سەر بە یەکێک لەم دووانەن».

### ١٦٥٥

سولّتانی عوسمانی، مەلیک ئەحمەد پاشای دڕندەی تورک، ڤالیی (وان)، دەنێرێتە سەر میرنشینی بەتلیس و وێرانی دەکا: سووتاندن و تالآنکردنی ماڵە میر، ئنجا شار و دێهاتەکان دەخاتەوە ژێردەستی عەسکەری تورک.

### ١٦٦٩

قەڵاچوالآن بووە پێتەختی میرنشینی بابان و لە سەردەمی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە (١٦٨٦) گەیشتە نەوپەڕی هێزی خۆی.





### ١٦٥٥-١٦٥٤

سووتاندن و تالآنکردنی تابلۆ و بەرهەمە هونەری و ئەدەبییەکانی عەبداڵ خانی هونەرمەند، کوڕی زیائودینی کوڕی شەرەفخان (٧٦ کتێبی دانراو) لەلایەن مەلیک ئەحمەد پاشای دڕندەی تورک، والیی (وان).

لە سەردەمی میری بەتلیس، عەبداڵ خان، کە وێنەکێش و خۆشنووس و نەخشکار (نەققاش)یش بووە، دۆخی هونەری نیگار و ئەدەبیات و مۆسیقا و گۆرانیی کوردی لەوپەڕی پێشکەوتندا بووە. لەم بارەیەوە، گەڕاڵی عوسمانی، ئەولیا چەلەبی، لە سەفەرنامەکەیدا، بەتایبەتی باسی مۆسیقای کوردی و گۆرانیبێژەکانی شاری مەلآتیە و دیاریەکر دەکا؛ چەند تێکستێکی گۆرانیی بۆمان تۆمار کردووە. یەکێک لە تێکستەکان، بریتییە لە گۆرانییەکی فۆلکلۆریی ناوچەی زاخۆ کە لەبارەی رووباری خابوورەوە بە مەقامی شووردکر دەیڵێن.

### ١٨٠٠-١٦٠٠

لە ناوچەی هەورامان کە بەشێک بوود لە میرنشینی سەربەخۆی ئەردەڵان، مەڵبەندێکی ئەدەبی دروست بووبوو بە دیالێکتی گۆرانی دەیاننووسی. مێجەرسۆن تەنیا پێنج شاعیری بە نموونە هێناوەتەوە: شێخ ئەحمەدی تەختی، مەلا تاهیری هەورامانی، محەمەد قولی سلێمان، مەحزوونی و فەرخی پاڵەنگانی. هەروەها: یووسف ئیسحاق کە لە ١٦٣٦دا کۆچی دوایی کردووە، لەگەڵ مستەفا بێسارانی. شیعرەکانیان لیریکای خۆشەویستی و سروشتن، کێشی سیلابین بە قافیەی مەسنەوی.

### ١٧٠١ -١٦٤٣

بێسارانی، کە شیعری بە هەورامی نووسیوە.

### ١٦٨٢

ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٧): داستانی مەم و زین؛ سەرهەڵدانی بیری کوردایەتی لە ئەدەبیاتی کوردیدا. خانی لەوە گەیشتبوو کە گەشەسەندنی کولتوور، بەوە دەبێ بە



کوردەکانی لوڕستان

کوردی بنووسرێ، بۆیە دەستی کرد بە گوتنەوەی دەرسی کوردی لە حوجرەکەیدا. هەروەها لە ساڵی (١٦٨٢-١٦٨٣) فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردی دانا بۆ منداڵان بە ناوی (نۆبار) کە دەبێتە یەکەمین قامووس لە مێژووی کورددا. ناوبراو وشەی عەکس و نەقش و نەقاشیی بەکار هێناوە:

گەنجینەئی جەوهەری ببت فاش

ئابت ببتن ژ نەقشی نەقاش

خانی ناوی ئەم ئامێرانە دەهێنێ لە کوردستاندا: سەنتوور، جەرەس، میزراب، زوڕنا، نەفیر، تەپڵ، کەمانچە، عوود، تەمبوور، ڕوباب، چەنگ، نای، قانوون، ئەرگەنوون، دەف.

ئەحمەدی خانی ناوی هەموو ئەم مەقامات و ئاوازانەیشی هێناوە کە لە کوردستاندا برەویان هەبووە: عوششاق، نەوا، نووج، کوردان، ڕەهاوی، گووشت، شەهناز، حەزین، ئاهەنگ، تەرەنوم، سەروسەهی، سەبا، نەوبەهاری، دڵگوشا، نەغمە، نسفیە، هوزار، ئەوازە، گوڵڕوح، دڵڕوبا..

لە ڕیزی سەرەوە، لە دەستە ڕاستەوە: یەکەم و چوارەم کەس، کوردی لوڕ و بەختیارین.



لە ڕیزی خوارەوە، دوو سەربازی سەلاحەدین ئەیووبی، پەڕی تاوسیان لە خوورزەکەیان بەستووە



قەڵای کوردان، دروستکراوی سەلاحەدین ئەیووبی لە نێزیک حەلەب لە سووریا

## ساڵانی ١٧٠٠

- میرنشینی ئەردەڵان، شاری (سنە) پایتەختیانە.
- عوسمانییەکان عێراقیان دابەش کردبووە سەر سێ ویلایەت: مووسڵ و بەغدا بەسرە. هەر ویلایەتێک والییەکی هەبوو. دومینیک لانزا دەڵێ: دانان و لابردنی هەر والییەک بەدەست سوڵتانەوە بووە. هەر و الییەکی هاتبێتە مووسڵێش خەڵکی مووسڵ نەبوود، نەوەندەش دەسەڵاتی بەسەر ویلایەتی مووسڵەوە نەبووە.

### ١٧٠١

قوباد پاشای میرنشینی بادینان (لە ئامێدی).

### ١٧١٧

کوردناسی فەرەنسی، (توورنەفۆرت) لە ساڵی (١٧١٧)دا بەدەست و قەڵەمی خۆی، بەپەرەمووچ وێنەی کورد و ژیانی کوردستانی رەسم کردووە و لە کتێبەکەیدا بلاوی کردووەتەوە.

### ١٧١٩

چەندان راپەرینی خوێناوی کورد لە کوردستانی ئێراندا دژ بە دەوڵەتی سەفەوی ئێران، راگوێزرانەوەی ژمارەیەکی زۆر لە بنەماڵە کوردەکان، لەلایەن شاعەباسەوە، بەرەو خوراسان و شوێنی تری دەرەوەی کوردستان، لەپێناو دامرکاندنەوە و لێک داپچرینی بزووتنەوەی نەتەوەی کورد.

### ١٧٢٦

فەرهاد پاشا میری بابانە؛ بارام پاشا میری بادینانە.

### ٩ی ئاداری ١٧٣٦

نادرشا حوکمڕانیی ئێرانی گرتە دەست و کوردستانی ئێرانی داگیر کرد. ئیتر لە ١٧٣٦ تا ١٧٤٧ خەریکی راگواستنەوەی زۆرەملێی کورد دەبێ بەرەو رۆهەڵاتی ئێران.

نادرشا لە ساڵی ١٧٣٦ دا لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی دەکەوێتە کێشەو گفتوگۆوە لەسەر کێشەی کوردستان و



## ساڵانی ١٧٠٠

لە سەردەمی ئەردەڵانەکاندا دەرەتانێکی باش بۆ گەشەکردنی هونەری کوردی بەتایبەت شیعر خوڵقابوو کە تا کۆتاییی سەدەی هەژدەمیش درێژەی کێشا.

سروشتی شیعرپەروەریی ناوچەکە و لاسایکردنەوەی خانانی ئەردەڵان لە "دەربار"ی شایانی ئێران بۆ نازپێدانی شاعیران، دوو هۆی سەرەکی بوون بۆ برەوپێدانی ئەدەبی کوردی لە ناوچەی ئەردەڵاندا.

ئەدەبی ناوچەکە بەگشتی شوێنی زۆری ئەدەبی فارسیی لەسەر بوو. بەشێک لە شاعیران بە فارسی شیعریان دەگوت (مەستوورە، نەفسەر، رەونەق) بەشێکی تریش بەرهەمی فارسییان وەردەگێڕایە سەر کوردی ( خانای قوبادی، میرزا شەفیعی کەندوڵەیی، ئەڵماس خانی کەندوڵەیی). وەرگێڕاوەکان هەرچەند لە چوارچێوەی دەقە بێگانەکاندا قەتیس دەمانەوە، بەلام رەنگ و بۆنی ژیانی کوردەواری و زمانی کوردییان دەدا. یەک لەو تەرجەمانە خوسرەو و شیرینی نیزامی گەنجەوییە کە لەگەڵ چەند بەرهەمێکی تریشی، لەلایەن خانای قوبادییەوە کراون.

- گۆرانیی (سیاچەمانە) لە شێوە و کلێشەی هیجایی، دوو میسراعی، لە هەورامان، پاشماوەی سترانە زەردەشتییەکانە. ناوەرۆکێکی دینی و عیرفانیی هەیە. نووسەری ناوداری عەرەب، شمس قیس رازی لە (کتاب المعجم في معايير اشعار العجم) باسی لێ دەکا.

### ١٧١١

- پەندی کوردی بە ئەلفابێی ئەرمەنی.
- د. کەمال مەزهەر، لەبارەی دەسنووسە کوردی بە ئەلفابێ ئەرمەنییەکانی ئارشیفخانەی شاری ماتێنەدەرانەوە لە ئەرمەنستانی سۆڤیەتدا دەڵێ کە لەوێدا " ئینجیلێکی دەسنووس بە زمانی کوردی و بە پیتی ئەرمەنی هەیە کە دوور نییە لە سەدەی هەژدەدا نووسرابێتەوە

دیاریکردنی سنووری نێوان دەوڵەتی ئێران و عوسمانی، زنجیرەیەک راپەڕین و شەڕوشۆڕی خوێناوی لە نێوان کورد و لەشکری نادرشادا.

**١٧٧٩ -١٧٤٧**

فەرمانڕەوایەتیی کەریم خانی زەند، کە بە بنەچە کورد بوو، لە ئێراندا؛ پایتەخت: شیراز.

کاتێ کەریم خانی زەند فەرمانڕەوای ئێرانە؛ شەڕوشۆڕ لە نێوان بابان و ئەردەڵان پەیدا دەبێ.

لە ١٧٧٩ بنەماڵەی قاجارەکان دەسەڵات لە کەریم خانی زەند دەستێننەوە و جڵەوی حکومەتداریەتی ئێران دەگرنە دەست.

**١٧٥٢**

خەسرەوخانی ئەردەڵانی مل بۆ سەلیم پاشای بابان کەچ دەکا. لە ١٧٦٣ سلێمان پاشا (کە لە ١٧٤٧ بووەتە میری بابان) هێرش دەکاتە سەر ئەردەڵان و دەشکێ.

**١٧٧٣ -٧١**

**بێ بارانی و تاعوون و قاتوقڕییە ناودارەکەی کوردستان.**

**١٧٧٩**

مەحموود پاشای باوکی ئەوڕەحمان پاشا دەبێتە میری بابان.

**١٧٨٤ -١٧٨٣**

دامەزراندنی سلێمانی لەلایەن ئیبراهیم پاشای بابانەوە لە سەردەمی دوایین ساڵی فەرمانڕەوایەتیی باوکییەوە، سلێمان پاشا.

عەبدولڕەحمان پاشای بابان (١٧٨١- ١٨١٤) هانی کوردە کۆچەرییەکانی دا بۆ ئەوەی شێوەی کۆنفێدراڵیەتی جافایەتیی خێڵەکی بگۆڕدرێ بۆ جێگیربوون لەناو میرنشینەکەی، ئەویش بە بەخشینی زەویوزارێکی زۆر پێیان و وردە وردە کەوتنە داچاندنی کێڵگە و کشتوکاڵکردن و خانوو بیناکردن لەو ناوە، کە چوار ساڵ درێژەی کێشا تا شارەکە دروست بوو.



**١٨٠١ ١٧٤٥**

وەلی دێوانە، کە شیعری بە هەورامی نووسیوە،

**١٧٥٠**

خانای قوبادی (١٧٠٤- ١٧٧٨) لە شیرین و خوسرەوەکەیاندا ناوی سی (٣٠) لە ئاوازە کوردییەکانی بردووە. بە یەکەمین وەرگێڕ دادەندرێ: فارسی - کوردی.

**١٨٠٩ -١٧٥٠**

ڕەنجووری، بە دیالێکتی گۆران شیعری نووسیوە. یەکەم کوردە کرۆنۆلۆجیای کوردستانی نووسیبێتەوە، بە فارسی (ساڵنامە).

؟١٧٥٠: د. کەمال فوئاد لە کەتەلۆگی دەسنووسە کوردییەکانی پارێزراو لە کتێبخانەی بەرلین باسی دوو نوسخەی خوسرەو و شیرین (٢٠ و ٨٨) و سێ نوسخەی شیرین و فەرهاد ( ٢ و ٢٠ و ٨٩) دەکات و بە هۆنراوەی ئەڵماس خانی کەندوڵەیی و میرزا شەفیعی کەندوڵەیی ناویان دەبات. چەندان تابلۆ و نیگاری سەدەی ١٨م دەبنە گەنجینە بۆ مێژووی هونەری شێوەکاری.

**١٨٢٥ - ١٧٥٦**

پرتەو بەگی هەکاری بە کرمانجیی ژووروو شیعر دەنووسێ.

**١٧٥٨**

حارسی بەتلیسی بە کرمانجیی ژووروو شیعر دەنووسێ.

**ناوەڕاستی ساڵانی ١٧٦٠**

مەلا محەمەدی سێوچی (؟ - ١٧٧٦): (تذکرة الاعوام) (بەیتی ئەوەڵ و ئاخر)، بە کوردی، پەخشان و شیعرە (٤٠) لاپەڕەیە. محەمەد عەلی قەرەداغی چاپی کردووەتەوە: چاپخانەی کامەران، سلێمانی: ١٩٧٩.

- ماوەی ١٧٥٨- ١٨٢٢ بە سەردەمی زێڕینی مزگەوتی گەورە دادەنرێ، چونکە لەو کاتەدا شێخ مەعرووفی نۆدێ و باوکی، لەوێ دەرسیان گوتووەتەوە.

- شێخ مەعرووفی نۆدێ (١٧٥٣- ١٨٣٧ )، بەهۆی

## ١٧٨٤ ـ ئابی١٨٣٦

میرنشینی سۆران، پایتەختەکەی لە ڕەواندز بووە. پاشای کۆرە لە چارەکی یەکەمی سەدەی ١٩مدا فەرمانڕەوا بووە.

## ١٧٧٩

دەوڵەتی بنەماڵەی قاجارییەکان لە ئێران، کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی کەریم خانی زەند.

## ١٧٩٤

قاجارییەکان دەسەڵات لە کەریم خانی زەند دەسێننەوە و دەبنە فەرمانڕەوای ئێران: فەتح عەلی شا.

- ئەوڕەحمان پاشای بابان چیای سنجاری گرت و گەیشتە ئورفە.

## ١٧٩٩

ئەوڕەحمان پاشای بابان بە فەرمانی بەغدا کرا بە حاکمی حەریر و کۆیە، دواتر بۆ حیللە دوورخرایەوە. پاشان سلێمان پاشای بابانیش کوژرا.





باوکییەوە گەیشتووەتە قەڵاچوالانی بابانەکان. ئنجا لە سلێمانی دەیان قوتابیی پێ گەیاندووە.

## ١٧٧٢ ١٨٣٢

مرادخانی بایەزیدی بە کرمانجیی ژووروو شیعر دەنووسێ.

## ١٧٨٤

کتێبخانەی مەلا عەلی سەححاف لەلایەن مەلا برایمی قولەڕەشییەوە: کتێب فرۆشتن و بەرگ تێگرتن و چاککردن و نووسینەوە، لە شارەزوور.

## ١٧٨٧

یەکەمین قامووسی ئەورووپی - کوردی (ئیتالی - کوردی)، یەکەمین کتێب لەبارەی ڕێزمانی کوردی، نووسراوی قەشەی ئیتالی، مۆریزیۆ گارزۆنی Morizio GARZONI، کە لە ڕۆما بە ناونیشانی Grammatica e vocabulairio della lingua kurda بلاوی کردووەتەوە؛ ناوی کورد و زمانی کوردیی بۆ یەکەم جار کردووەتە ناونیشانی کتێبێک؛ لەگەڵ چەند کورتە تێکستێک بە زمانی کوردی.

گارزۆنی، کە سەرۆکی وەفدێکی مژدەگاران بوو، لە ساڵی ١٧٦٢دا دەگاتە مووسڵ، ئنجا دوو ساڵ درەنگتر لەگەڵ وەفدەکە دەچنە ئامێدی و تا ١٧٧٠ لەوێ دەمێننەوە، پاشان گارزۆنی لە ١٧٨٣دا دەگەڕێتەوە ڕۆما. لە ساڵی ١٧٨٦ تا ١٧٨٩ دیسان لەگەڵ وەفدێکی تری مژدەگاران دێتەوە مووسڵ. ئنجا پاشان دەگەڕێتەوە ڕۆما و ساڵی ١٧٩٠ کۆچی دوایی دەکا. کوردناسەکان بەم قەشە ئیتالییەی دڵسۆزی کورد دەڵێن «باوکی کوردناسی و دامەزرێنی زانستی کوردۆلۆجی».

## ١٧٨٩- ١٨٨٥

کاک ئەحمەدی شێخی کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدێ.

## ١٧٩٠

(ابن آدم) بە زمانی کوردی پێشەکی بۆ کتێبە ئەستێرەناسییەکەی (مشکاة المنقول) دەنووسێ. مەسعوود محەمەد لە کتێبی (حاجی قادری کۆیی) باسی کردووە.

**١٧٩٣ - ١٨٧٦**

ئەحمەدبەگی کۆماسی، شیعر بە هەورامی.

**١٧٩٣- ١٨٧١**

ڕەحمەتوڵڵا سوڵتان، ناسراو بە (شەڵتاغ)، کوردی کفری، یەکێک لە مەقامبێژ و مۆسیقاژەنەکانی کوردستانی عێراق لە کەرکووک و بەغدا، مەقامی تفلیسی داهێناوە. شێخ جەلال حەنەفی لە (المغنیون البغدادیون) باسی دەکا.

**١٧٩٧- ١٨٥٥**

نالی، بناخەدانانی شیعر نووسین بە دیالێکتی (سۆرانی).

**١٧٩٧- ١٧٩٨**

نووسەرێک بە ناوی (مەلا مەحموود) بە دیالێکتی کرمانجی کتێبێک لەبارەی پزیشکی بە ناوی (طوبیا کوردی) دەنووسێ. لە گەنجینەی م. (عبدالرقیب یووسف) پارێزراوە.

**١٧٩٩**

دەسەڵاتی عەبدولڕەحمان پاشای میرنشینی بابان لە ناوچەی شارەزوورەوە تا کۆیە و هەریر و دەوروبەری کەرکووک ڕۆیشتبوو. وردە وردەش زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو تایبەت بەو ناوچەیە سەری هەڵدابوو، شیعر و ئەدەبیاتێکی پێ نووسرابوو کە تا ڕادەیەک جیاواز بوو لەو دیالێکتەی کە لە سەردەمی خانی و جەزیری (لە ساڵانی ١٦٠٠) بەکار دەهات.

**١٧٩٩**

مەلا محەمەدی شەریف (قازیی ئەردەلان): زبدة التواریخ، بە زمانی فارسی، لە ١٧٩٩ لەبارەی مێژووی کوردستان و میرنشینی ئەردەلان نووسراوە.



کوردستانی تورکیا
میناتۆرێکی سەدەی هەژدە

## ژیانی سیاسی

### سالانی ۱۸۰۰

**۱۸۰۲**

ئەورەحمان پاشای بابان، ئامانجی: رزگارکردنی کوردستان بوو لەدەست عوسمانییەکان و قاجارییەکانی ئێران. لە چارەگی یەکەمی ئەو سەدەیەدا زنجیرەیەک شەڕ و پەلاماری لە هەردوو لاوە دەکرێتە سەر.

**۱۸۰٦ ۱۸۱۲**

شەڕی نێوان رووسیا و دەوڵەتی عوسمانی ڕەوکردن و ئاوارەبوونی کورد لە تورکیاوە بەرەو رووسیا.

**۱۸۰۷**

دەسەلاتی عەبدولڕەحمان پاشای بابان لە (۱۸۰۷) شکستی خوارد و پەنای بردە ئەمانوللای ئەردەلانەکان لە سەقز.

عەبدولڕەحمان پاشای بابان لە (۱۸۱۳) چووەوە سلێمانی و دەسەلاتی گرتەوە دەست.

**۱۸۱۲**

بەدرخان پاشا دەسەلاتی میرنشینی بۆتان لە جەزیرە دەگرێتە دەست

**۱۸۱۸**

موبەشیرە ئەمریکاییەکان یەکەم سەنتەری تەبشیرییان لە (ورمێ) دامەزراند، کە سەر بە ئەنجوومەنی ئەمەریکایی بوون لە بۆستۆن.

**۱۸۱۸**

ئەو دەمەی مستەر ریچ (لە ۱۸۱۸-۱۸۲۰) دەچێتە سلێمانی مەحموود پاشا میری بابان بووە.

**۱/ ٤ / ۱۸۲۰**

گەڕاڵی ئینگلیز،، مستەر ریچ دەگاتە کوردستان: باس و خواسەکانی شاری سلێمانی و میرنشینی بابان.

## ژیانی کولتووری

### سالانی ۱۸۰۰

**۱۸۰۰- ۱۸۳٤**

خوسرەو بەگی ئەردەلانی: لب التواریخ (کاکڵەی مێژووەکان) بە زمانی فارسی لەبارەی مێژووی کورد و ئەردەلانەکان لەسەر داخوازیی خوسرەو خانی دووەمی ئەردەلانی – ناکام (۱۸۰۰- ۱۸۳٤) لە سالانی (۱۸۰۰- ۱۸۳٤) نووسراوە.

**۱۸۱۰**

محمد ابراهیم اردلانی: ذیل شرفنامە، لە ۱۸۱۰ بە فارسی، لەسەر راسپاردەی امان الله خانی گەورەی ئەردەلانی (۱۷۷۵- ۱۸۲٤)، لەبارەی مێژووی کوردستان نووسراوە.

**۱۸۰۰- ۱۸٦٦**

سالم، لە مەڵبەندی بابان، شیعر بە (سۆرانی).

**۱۸۳۵ - ۱۸۹۵**

مەریێنی قەشە، یەکێک لە مەقامبێژ و مۆسیقاژەنە ناودارەکانی کۆیە.

**۱۸٤۵**

مەستوورە خانمی ئەردەلانی (ماە شەرەفخانم) ۱۸۰۵- ۱۸٤۷، جگە لەوەی کە شیعری بە کوردی و فارسی نووسیوە، بە یەکەمین ژن دەژمێردرێت لە هەموو ڕۆهەلاتدا کە مێژووی نووسیبێتەوە: «تاریخی ئەردەلان» بە زمانی فارسی.

مەستوورە لە ۱۸۲۸ بووەتە هاوسەری خوسرەو خانی ئەردەلانی، بۆ ماوەی ٦ ساڵ.

**۱۸۰٦- ۱۸۸۲**

مەولەوی، شیعر بە هەورامانی.

**۱۸۰٦- ۱۸۷٦**

مەلای جەباری

| ژیانی سیاسی | ژیانی کولتووری |
|---|---|

**١٨٢٥**

کۆچی دوایی عوسمان پاشای بابان..

**١٨٢٨ ـ ١٨٢٩**

شەڕی تورکیا ـ رووسیا

**١٨٣٢**

راپەڕینی میر محەمەدی ڕەواندزی (پاشای کۆرە).

**١٨٣٦**

میر محەمەد ڕەواندزی لە ١٨٣٦ نەفی دەکرێ بۆ ئەستەمبوڵ، سوڵتان مەحموودی دووەم پێشوازیی لێ دەکا.

**١٨٣٧**

- رووخانی فەرمانڕەوای بادینان بەدەست عوسمانییەکان
- هێرشی تورک بۆ سەر میرنشینی بۆتان.
- کوژرانی پاشای گەورە لە ئەستەمبوڵ بەدەست تورکەوە.
- ڕەشید پاشای عوسمانی کاتێ قەتڵوعامی یەزیدییەکانی کرد، چوار پەیکەری هونەریی مەلەک تاوسی لەگەڵ خۆی برد کە لە ئاسن و زێڕ بەشێوەکی ڕەنگین و درەخشان دروست کرابوون.

**١٨٣٨**

کۆمەڵەی زانیاریی مەسیحی Christian Knoledge Socity ئاینسۆرس و رسامی راسپارد تا لێکۆڵینەوەیەک لەسەر بارودۆخی نەستۆرییەکانی کوردستان بکەن.

**١٨٣٩ ـ ١٨٤١**

بەدرخان پاشا (١٨٠٦ ـ ١٨٦٩)، لە مەڵبەندی جزیرە و بۆتان جاری سەربەخۆیی کوردستان دەدا: لە ١٨٤٢ ئاڵا و دراوی خۆیشی دادەمەزرێنێ. میرنشینی بەدرخان پاشا تا ساڵی (١٨٤٧) بەردەوام دەبێ.

**١٨٠٨ ـ ١٨٨١**

سەی یاقۆ (سەید یاقۆ)، شیعری بە هەورامی

**١٨٠٩ ـ ١٨٤٩**

کوردی، شاعیری ناوچەی بابان.

**١٨١٤ ـ ١٨٨٣**

کەیفی، شاعیری کۆیە.

**١٨١٥ ـ ١٨٩٧**

حاجی قادری کۆیی؛ شیعری نیشتمانی.

**١٨١٩**

«عەقیدەنامەی کوردی». مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩ ـ ١٨٢٧)، وەری گێڕاوەتە سەر کوردی و لە ١٨٧٧دا ـ نزیکەی نیو سەدە دوای کۆچی دوایی خۆی ـ بە دەستی مەلایەک سەرلەنوێ نووسراوەتەوە، بەڵام کۆنترین دەستنووسی ئەم تێکستە لای م. کەمال رەئووف پارێزراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨١٩. تێکستەکە پێنج فەرزەکەی دینی ئیسلام بە زمانی کوردی دەخاتە ڕوو.

**١ / ٤ / ١٨٢٠**

مستەر ریچ لە سەفەرنامەکەی خۆیدا؛ باس و خواسی گۆرانی و مۆسیقای کوردی و مۆسیقای یەزیدییەکان، دوو نیگاریش لەم بارەیەوە دروست دەکا.

ریچ دەڵێ: «پاشاکانی بابان هەفتەی جارێک یان دوو جار کۆ دەبوونەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ پیاوماقووڵەکان گوێ لە گۆرانی و مووزیک بگرن»، «ئەو کاتە دەهۆڵ، زورنا، دووزەلە، شمشاڵ، تەپڵ، بلوێر، دەف.. هەبوو». مستەر ریچ لە ٢٣ی ئاداری (١٨٢٠) لای هۆزی (سووردەمەنی) لای بابانەکان گوێی لە کەمانچە و ڕوباب و گۆرانیی کوردی ڕاگرتووە. پاشانیش چیرۆکی شیرین و فەرهادیان بە گۆرانی بۆ گوتووە.

- کولتووری وێنە فراوانە لای یەزیدییەکان وەک لە

## ١٨٤٢

مار شەمعوون، کە لایەنگیری دەوڵەتی عوسمانی بوو دژی میرنشینە کوردییەکان، داوای لە کەنیسەی پرۆتێستانتی ئینگلیز کرد بۆ ئەوەی نوێنەریان بێتە کوردستان بۆ ئەوەی بارودۆخی نەستۆرییەکان باشتر بکەن لە کوردستاندا.

## ١٨٤٣- ١٨٤٦

شەڕی ناوخۆی نەستۆری - کورد لە سەردەمی مار شەمعوون کە پشتیوانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو.

## ١٨٤٧/٥/١٩

پەیمانی ئەرزەڕۆم لە نێوان عوسمانی و فارسەکاندا: دابەشکردنێکی نوێی کوردستان بەسەر خۆیاندا.

## ١٨٤٧/٧/٢٧

لەشکری عوسمانی هێرشی کردە سەر میرنشینی بەدرخان و لە ١٨٤٧/٧/٢٧ میر بەدرخان (١٨٠٢- ١٨٦٨) دەسگیر کرا و نەفی کرایە دوورگەی (کریت) و پاشان لە ١٨٦٨ لە (ركن الدين) لە دیمەشق سەری نایەوە.

## ١٨٥١

رووخانی میرنشینی بابان بەدەستی تورکە عوسمانییەکانەوە کە دوا میریان عەبدوڵا پاشا بوو.

## ١٨٥٣- ١٨٥٥

راپەڕینەکانی یەزدان شێر لە ناوچەکانی هەکاری، کە لە ١٨٥٥ توانییان مووسڵیش ئازاد بکەن؛ لە ١٨٥٥ بەغدای عوسمانی سوپایەکی کۆ کردەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەیان. ژمارەی چەکدارەکانی یەزدان شێر (٦٠٠٠٠) کەس بوون.

## ١٨٥٤

ساڵی (١٨٥٤) قەرە فاتم خۆی و سێسەد سوارچاکی تری کورد لە مەڕەشەوە هاتوونەتە ئەستەمبوڵ و چوونەتە بەردەم پاشا بۆ ئەوەی بەشداری لە شەڕی عوسمانی بکەن دژی دەوڵەتی رووسیا لە ١٨٧٨.



پەرستگاکان و سنووقی کتێبە پیرۆزەکانیشیان دەردەکەوێ. (رەشید پاشای عوسمانی کاتێ قەتڵوعامی یەزیدییەکانی کرد، چوار پەیکەری هونەریی مەلەک تاوسی لەگەڵ خۆی برد کە لە ئاسن و زێڕ بەشێوەکی رەنگین و دردەخشان دروست کرابوون).

## ١٨٣٠- ١٩٠٤

مەحوی، شاعیری گەورەی (سووفی)

## ١٨٣٠

مەلا ئەبوبەکرەفەندی (١٧٧٨- ١٨٥٥) باپیری مەلا فەندی (مەلای گچکە)، بایەخی داوەتە مەولوود و مەقامات. لە ١٨٣٠ دەنێرن مەلا عەبدولڕەحمان وەلی لە کەرکووکەوە بێتە هەولێر بۆ مەولوود و مەقامات.

- مستەفا بەگی کوردی (١٨٠٩- ١٨٤٩) باسی چەندان گۆرانیبێژی سەردەمی خۆی دەکا کە بەکوردی گۆرانییان گوتووە.
- لە ناوچەی بابانەکان لە سلێمانی، دوانزە سوارەی مەریوان لە کاتی شەڕدا تەپڵ و ئامێرە مۆسیقاییەکانیان بەکار دەهێنا

## ١٨٣٥- ١٩٠٩

شێخ رەزای تاڵەبانی، شاعیری (هەجوو)

## ١٨٤٠ - ١٨٦٠

مەدرەسەی قوبەهان: ئامێدی.

## ١٨٤٣

کتێبی سەرەنجامی ئەهلی حەق

## ١٨٤٤

یەکەمین چاپکراوی کلاسیک، بە کوردی، دیوانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، ئەستەمبوڵ: ١١٠ ل، (چەند شیعرێکی بە هەورامی تێدایە).



سوارچاکی کورد
H.Binder

۱۸٤٤-۱۹۱٤

وەفایی، شاعیری لیریک، کە ئاوازدانەریش بوو.

۱۸٤٥-۱۹۰۹

سالمی سنەیی

۱۸٤۹-۱۹۲٥

مەجدی

۱۸٥۱-۱۹۰۷

حەریق

۱۸٥۳-۱۹۱۷

مەلا حەمدوون، شاعیری نابینای سلێمانی.

۱۸٥٤

حاجی قادری کۆیی لەگەڵ کەیفی جوانڕۆیی چووەتە ئەستەمبوڵ. ناوبراو، لە دوای نالی، یەکەمین شاعیری کوردە لە مێژوودا دەکەوێتە ناو کەشوهەوای ڕۆشنبیریی تورک و ڕۆئاوایی؛ چەمکە ئەوروپاییەکان لەبارەی کۆمەڵ و ئازادی و سەربەخۆیی وڵات کاریان تێ دەکات.

– شێخ ڕەزا لە ماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا ماوەیەکی ژیانی لە ئەستەمبوڵ بەسەربردووە.

۱۸٥٦ - ۱۸٦٦

مەلا مەحمموودی بایەزیدی (۱۷۹۹؟- ۱۸٦۰) کۆمەڵێک چیرۆک و تێکست و کتێبی مێژوویی (بە دیالێکتی کرمانجیی باکور) دەنووسێت، کە بە هاوکاریی ئەلکزەندەر ژابای کونسوڵی ڕووسیا لە ئەرزەڕۆم خراونەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەڕەنسی کراون: مەم و زین (۱۸٥٦) کە دەبێتە یەکەم چیرۆکی بڵاوکراوەی کوردی؛ لەیلا و مەجنوون (۱۸٥۹)؛ سیابەند و شەمسێ (۱۸٦۰)؛ کیتابی مەولوودی شەریف (۱۸٥۸)؛ تەواریخی جدیدی کوردستان (۱۸٥۷)؛ (صفحة صبیان) کە بریتییە لە کتێبی ئەلف و بێی

زمانی کوردی بۆ منداڵان؛ (رسالة تحفة النحلان في الزمان کـردان) لەبارەی رێزمـانی کـوردی (١٨٦٦)؛ (جـامع یی رسالیان و حکایتان)، چل چیرۆکی کـوردییـە، کە دەبێتـە یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بە کتێب (١٨٦٠)؛ تەواریخی قەدیمی کـوردسـتـان (١٨٥٨ـ ١٨٥٩)؛ عـادات و رسـوومـاتنـامـەی ئەکرادیە؛ هەروەها کتێبە رێزمـانییەکەی عەلی تەرەمـاخی (صـرف و بعـضی اصـول لازمـە یی تعلیـمـە بزمـانی کـورمـانجیـە) کە برێتییـە لە رێزمـانی عـەرەبی بە زمـانی کوردی، لە سـەرەتـای سـەدەی حـەڤدەمـدا نووسـراوە. بەڵام بایەزیدی ئەم کتێبەی سەرلەنوێ لە ١٨٥٧دا نووسیوەتەوە.

### ١٨٥٦

وەرگـێـڕانێکی پەخـشـانیی ئەسکەندەرنامـەی نیـزامی گەنجەوی کە (شەهنەزەر) ناوێک لە ئەرزەرۆم کردوویەتیە کرمانجیی باکور.

### ١٨٥٧

– یەکەمین جار لە ئەستەمبوڵ ئینجیل لە زمانی یۆنانییەوە تەرجـومـەی سـەر زمـانی کـوردی (دیالێکتی کـرمـانجـیی ژووروو) دەکرێ و بە ئەلفابێتی ئەرمەنی، لە (٣٠٦) لاپەڕەدا، لە چاپخـانەیەکی ئەرمـەنییـەکـان لە ئەسـتـەمـبـوڵ بڵاو دەکرێتەوە.

– ئەحمـەد خـانی چوارەمین پاشـای میرنشـینی بابان لە ساڵی ١٨٥٢ سەری لە پاریس داوە و مـیـوانی رۆهەڵاتناس، خۆدزکۆ CHODZKO بووە. چەند باسێکی زمانەوانی و چەند چیرۆکێکی بە زمانی کوردی بۆ خۆدزکۆ نووسیوە و لە ساڵی ١٨٥٧دا لە شێوەی نامیلکەیەکدا بڵاو کراونەتەوە.

### ١٨٥٨

– سلێـمـان بەگی قـەواس توانیویەتی یەکـەم قـوتابخـانەی روشدیەی موڵکی لە سلێمانی بکاتەوە کە چوار پۆلی تێدا بووە. ئەم قوتابخانەیە، بەپێی سـاڵنامـەی ویلایەتی مـووسڵ، لە سـاڵی ١٨٨٣دا ژمارەی قوتابییەکانی ١٠٣ قوتابی بووە، بەڕێوەبەر: حـاجی عـەبدولفـەتاح ئەفـەندی بـووە و سێ مـامۆسـتـای هـەبووە. پیرەمێردی شاعیر لەم قوتابخانەیەدا


1861

ئەلفا بێ جێ یا کوردی
بەزمانی کوردی، بەئەلفابێتی ئەرمەنی
(ئەستەمبوڵ)

### ١٨٧٨ -١٨٨٢

ڕاپەڕینەکانی شێخ عوبێدڵای نەهری و نووسینی نامەکانی بۆ کونسوڵی ئەمەریکایی و ئینگلیز لەپێناو سەربەخۆیی کوردستاندا کە لە ١٨٨٠دا دەگاتە بزاڤی چەکداری و زیاتر لە (٥٠٠٠) چەکداری هەبوو. دژی ئێران و عوسمانییەکان دەجەنگێن.. تا لە ئۆکتۆبەری ١٨٨٢ شێخ عوبێدڵای لە هەکاری بەدیل گیرا و نەفی کرایە مەکە.

- ڕاپەڕینی نەوەکانی بەدرخان پاشا؛ جەزیرە و بۆتانیان خستەوە ژێر دەستی خۆیان.

### ١٨٨١

- لە ساڵی (١٨٨١) توێژی فەرمانبەر و کاسپکاری سلێمانی ڕاپەڕیوە و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دەستی بەسەر داوودەزگاکانی حکومەتی عوسمانیدا گرتووە.

### ١٨٨٦

لە حەمرین کورد دژی عوسمانی دەوەستێ.

### ٢١/٥/١٨٨٩

دامەزراندنی یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی، ڕێکخراوی (اتحاد و ترقی) لە ئەستەمبوڵ لەلایەن دوو ڕووناکبیری کوردەوە (د. عەبدوڵا جەودەت و ئیسحاق سکووتی): لەپێناو ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دامەزراندنی سیستەمێکی پەرلەمانتاری و دیموکراسی.

د. عەبدوڵا جەودەت، دامەزرێنی یەکەمین ڕێکخراوی سیاسی کە لەلایەن کوردەوە دامەزرابێ لە ساڵی (١٨٨٩) لە ئەستەمبوڵ، بۆ یەکەمین جار ناو لەم نەسلە کوردە ڕووناکبیرە نوێخوازە دەنێ «کوردە گەنجەکان». ناوبراو بۆ خۆیشی یەکێک بوو لەو وەچە گەنجە گۆڕانخوازە و دامەزرێنی ڕێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوو کە پاشان بووە هۆی درستبوونی (بزاڤی گەنجە تورکەکان).

(گەنجە کوردەکان) ئەو نەوە ڕووناکبیر و نووسەرە نوێخوازە کوردە بوون کە لە کۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی بیستەمدا سیستەمە مەعریفییە کۆنەکەی خوێندوویەتی. حەریق لەبارەی قوتابخانەی ڕوشدییەوە دەڵێ:

ئەم تاقمە شیرینە لە مەکتەب کە دیارن
جەللادی دڵی عالەم و ناشووبی دیارن

- ڕەشید زەکی کابان (١٨٦٧ - ١٩٤٠) کە خۆی دەرچووی قوتابخانەی ڕوشدیەی سلێمانی بووە، پاش تەواوکردنی ئیعدادی عەسکەری لە بەغدا و دانشگای سوپایی لە ئەستەمبوڵ، بووەتە مودیر.

### ١٨٥٩- ١٩١٦

مصباح الدیوان ئەدەب

### ساڵانی ١٨٦٠

وەرگێڕانی مەولوودنامەیەک لە زمانی عەرەبییەوە، لەلایەن شێخ حوسێنی قازی (١٧٩١ـ ١٨٧٠)، بۆ دیالێکتی کرمانجیی خواروو لە ساڵانی ١٨٦٠دا کراوە. بەرهەمەکە بە شیعر و پەخشان ژیاننامەی پێغەمبەر لە شێوەی مەولوودنامەدا دەگێڕێتەوە.

- یەکەم چاپخانە لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٨٦٠ لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی (لە بەتلیس لە ١٨٦٦ یان لە ١٨٩٣، لە دیاربەکر لە ١٨٦٩، لە وان لە ١٨٨٩) دامەزران، بەڵام هەموویان لەبن دەستی دەوڵەتی بوون و بە زمانی تورکی بوون.

### ١٨٦١

کتێبی (ئەلفابێ جێ یا کرمانجی) لە ئەستەمبوڵ لەلایەن کۆمەڵێک موژدەگار و قەشەی ئەرمەنییەوە بەهاوکاریی چەند کوردێک چاپ کراوە. کتێبەکە، کە پڕە لە وێنە و گراڤوور و هێڵکاریی جۆراوجۆر، بە ئەلفابێی ئەرمەنی، بەڵام بە زمانی کوردی (بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروو) چاپ کراوە و پڕە لە بابەتی جۆراوجۆری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بە زمانی کوردی، بە جوانترین دیزاین و ڕازاوەترین دیزاینی مۆدێرنی ئەو سەردەمە، لە چاپخانەیەکی ئەرمەنییەکان لە ئەستەمبوڵ چاپ کراوە. باسی مێژووی مەسیحییەتە، زیاتر لە (٣٥) نیگاری تێدایە.

١٨٦٣ ـ ١٩٤١

حاجی محەمەد عەلی، ناسراو بە سابیر، زیاتر لە نیو سەدە خۆشنووسیی کردووە و خزمەتی ئەم هونەرەی کردووە. تا ئێستاش لە گەلێک شوێنی بەغدا پاشماوەی بەرهەمەکانی ماوە.

١٨٦٤ ـ ١٨٦٩

محەمەد ئەمین یمنی (مەلا ئەمین)، کۆییە، لە بەغدا ژیاوە، خۆشنووس بووە. یەکەم کەسە مۆری لە عێراقدا بڵاو کردەوە.

١٨٦٦

ئەبول موحسین، پێشخزمەتی ئەردەڵان، لەسەر ڕاسپاردەی ناسرەدین شای قاجار، لە ساڵی (١٨٦٦) فەرهەنگێکی کوردی (ئەردەڵانی) - فارسیی نووسیوە کە ٤٣ لاپەڕەیە. (٥٣١) واژەیە.

١٨٦٧ ـ ١٩٥٠

پیرەمێرد

١٨٧٠ - ١٩٣٨

میرزا غەفوور

١٨٧٣ - ١٩٤٢

سافی ، شاعیری ناوچەی هیران. مۆسیقاناسیش بووە

١٨٧٣ - ١٩٤٦

مەلا مارفی کۆکەیی

١٨٧٤ - ١٩٣٢

ئەدیب

١٨٧٤ ـ ١٩٤٤

ناری



ئافرەتی کورد لە ساڵانی ١٧٠٠
مۆسیقای ژەنیوە
ئەرشیفی: د. محەمەد موکری



ئەورەحمان پاشان بابان
؟ - ١٨١٣ ز

١٨٧٥ ـ ١٩١٧

تاهیربەگی جاف

١٨٧٥ - ١٩٢٨

خالیسی

١٨٧٥ ـ ١٩٤٨

زێودر

١٨٧٦ ـ ١٩٣٦

حەمدی

١٨٧٦ - ١٩٤٣

مەلا محەمەدی کۆیی (مەلای گەورە) لە کۆیە، یەکەمین مەلا بووە کە کچی خۆی ناردووەتە مەکتەب.

١٨٧٤ ١٩٥٢

سەید مەردانی گۆرانیبێژی کەرکووک.

١٨٧٥ - ١٩٣٦

حوسێن حەشامەتی، مەقامزان.

١٨٧٦

لە هەولێر، یەکەم قوتابخانەی فەرمی کراوەتەوە. بەڕێوەبەری قوتابخانەکە مەلا رەئووفی خدر ئەفەندی بووە. لە ١٨٩٤دا (٣٦) قوتابیی لێ بووە.

١٨٧٧

«عەقیدەنامەی کوردی». مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩ـ ١٨٢٧) وەری گێڕاوەتە سەر کوردی و بە دەستی مەلایەک سەرلەنوێ نووسراوەتەوە.

- شانۆنامەنووس، مەدحەت ئەحمەد ئەفەندی شانۆنامەیەکی بە تورکی (کورد قزی/کچە کورد) لەبارەی ژیانی کوردستانی تورکیا نووسیوە و لە شاری ئەستەمبوڵ

کوردستانیان هەڵتەکاند و دەستاوەردی نوێیان دایە وڵاتەکەیان. لە ٢ -٨- ١٨٩٨ ژنێف، د. عەبدوڵا جەودەت لە شیعرێکیدا بۆ عەبدولڕەحمان بەدرخان دەنووسێ:

ایام ما گذشت بغربت ولی چه غم

اشراق شرق شد اثر اغتراب ما

ئەمە وەرگێڕانە کوردییەکەیەتی بە شیعر:

ڕۆژەکانمان لە غوربەتدا بە هەدەر چوون، بەڵام چ باک

ڕۆژهەڵات سەرتاپا درەوشایەوە بە ئاوارەییی ئێمە

### ١٨٩٠؟-١٨٩١

جەندرمەی عوسمانی بەناو خەڵکی کوردستان دەکەون بۆ ئەوەی ڕەوانەی شەڕی بەلقانیان بکەن.

### ١٨٩٣- ١٨٩٤

بە کۆششی سەرۆک شوورای دەوڵەتی عوسمانی، سەعید پاشای کوڕی سلێمان بەگی خەندان، واتە باوکی جەنەراڵ شەریف پاشا، لە سلێمانی، قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری کرایەوە. دەرچووانی چوونەتە بەغدا و ئەستەمبوڵ. ئەمین زەکی بەگ و ئیسماعیل حەقی شاوەیس و مەعرووف جیاوک و ئەمین ڕەواندزی و دەیانی تر.. دەرچووانی ئەم قوتابخانەیەن. سەعید سدقی حەسەن کابان لە ١٩٠٣ بووەتە مامۆستا لەوێ.

### ١٨٩٥ یان ١٨٩٧

کاکل ئاغای گەردی لە حکوومەتی عوسمانی یاخی دەبێ، باج و سەرانە نادات. لە بەندیخانەی قەڵات زیندان دەکرێ.

گەردی، بە هاوکاریی هەندێ پیاوماقووڵانی قەڵا، شەوێک هێرش دەکەنە سەر بەندیخانەی قەڵای هەولێر و سەرۆکی پاسەوانەکان دەکوژن و کاکل ئاغا ئازاد دەکەن. پاشان کاکل ئاغا پەنا دەباتە بەر سەید تەهای نەهری و لەلای عەشیرەتی شکاک دەمێنێتەوە. سەید تەها و مەلافەندی تکا لە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم دەکەن بۆ ئەوەی عەفووی بکەن و دەگەڕێتەوە هەولێر.



لەسەر شانۆ پێشانی خەڵک دراوە.

### ١٨٧٨- ١٩٦٧

عەبدولڕەحمان بەگی نفووس.

### ١٨٨٠

ژیانی دوو مەقامزان و گۆرانیبێژی ناودار، زەینەڵ حەمباڵی کوردی (١٨٤٢- ١٩١٨) و زەینەڵ ناڵبەندی کوردی (١٨٤٦- ١٨٩١).

### ١٨٨٢- ١٩٤٤

سابیری، شاعیری کەرکووک

### ١٨٨٢- ١٩٢٦

شوکری فەزڵی

### ١٨٨٢- ١٩٣٧

سەید ئەسغەری کوردستانی، گۆرانیبێژ .

### ١٨٨٢

خانەقای خانەقین دروست کراوە.

### ١٨٨٥- ١٩٥٨

مەعرووف جیاوک کە لە ١٩٠٢ دەچێتە ئەستەمبوڵ حقووق تەواو دەکا و لە ١٩٠٨ دێتەوە.

### ١٨٨٦- ١٩٧٤

کەماڵی (عەلی باپیر ئاغا).

### ١٨٨٧- ١٨٩٠

ئەلبێرت سۆسین و ی. پرێم، دوو بەرگ کتێب (کەشکۆڵی کوردی) لە سانت پیترسبۆرگ. گەلێ چیرۆکی فۆلکلۆری و داستانی کوردی بە وەرگێڕانی ئەڵمانییەوە تێدایە. پاشان لە ١٨٩٨ ـ ١٩٠١ لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانییان لەسەر ئەم تێکستانە بڵاو کردووەتەوە.

## ژیانی سیاسی

### ١٨٩٩-١٨٩٧

عەبدولڕەحمان بەدرخان، سەرنووسەری یەکەم ڕۆژنامەی کوردی، حاشا لە کوردەکەی خۆی دەکا، چونکە بەشداری کردبوو لە کوشتاری ئەرمەنییەکاندا. ( E.E. Ramaur: The Young Turks, P. 63)

### ١٨٩٨/٧/٩

جەنەڕاڵ شەریف پاشا دەبێتە باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم؛ لەژێرەوەش ئەندامی ڕێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی)یە دژ بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. پاشان عوسمانییەکان بۆسەی کوشتنی بۆ دادەنێنەوە.

### ١٩٠٠

عەزمی قەوی جەمعیەتی لە ئەستەمبوڵ، فیکری دیاربەکری دایمەزراند کە تا ١٩٠٤ بەردەوام بوو. ئەندامە چالاکەکانیان بریتی بوون لە ئەحمەد کوردیزادە و ئەحمەد خاسی زادە.

### ١٩٠٢

– کۆنگرەی یەکەمی ئیتیحادییەکان لە پاریس. حکمەت بابان و عەبدولڕەحمان بەدرخان، بەشدارییان تێدا کرد.

– ساڵی (١٩٠٢) کاسپکار و بازرگانەکانی سلێمانی (٨٢ بازرگان و ٢٤عولەمای دین) بۆ ماوەی یەک مانگ مانیان گرتووە و سێ برووسکەی نارەزاییان بەناوی (سلێمانیەلی توجارلەری) ناردووە بۆ سوڵتان عەبدولحەمید، داوای (حورییەت) و (عەدالەت)یان کردووە. بەکارهێنانی ئەم دوو زاراوەیە کە دروشمی شۆڕشی فەرەنسا بوون (وەک خۆی وەک لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە) نیشانەی بیری ڕۆشنگەریی بۆرژوازیەتی کوردیی ئەو سەردەمە بووە.

– بەپێی قسەی (مارک سایکس) لە ساڵی (١٩٠٢)دا: سەد و پەنجا دووکانی چەخماخسازی لە سلێمانی هەبووە و بەهرەمەند بوونە لە دروستکردنی چەکی جۆری (مارتینی). ئنجا بەپێی ڕاپۆرتێکی بەریتانی، لە ساڵی (١٩١٣) سێسەد و نۆهەت و نۆ دووکان و شەش بازاڕ و بیست و نۆ مزگەوت و (٣١) چایخانە و (١١) حەمام و (٢٠) خان و (٢٤) ئاشی ئاو و (٣٢٠٥) خانوو لە سلێمانی هەبووە.

## ژیانی کولتووری

### ١٨٨٧

کوردناسی ناوداری فەرەنسی (هینری بیندەر) لە ساڵی (١٨٨٧)دا، بۆ یەکەم جار کامێرای لەگەڵ خۆی هێناوەتە کوردستان و وێنەی ژیان و سروشتی وڵاتی کوردانیان گرتووە. پاشان (لۆکۆنت دوشۆلێت) لە ساڵی (١٨٩٢).

### ١٨٨٨

زمانی کوردی لە سەدەی نۆزدەمدا لە ناوچەکانی نێوان سنووری کوردستانی تورکیا – عێراق، بە ئەلفابێ و خەتی سریانی (کرشونی) نووسراوە. نموونەی یەکەم: ڕێزمانی کلدانی (سریانی/ ڕۆهەڵاتی) ـ کوردی، لەگەڵ تەرجەمەی چەند بەشێکی پەیمانی نوێ؛ وێڕای چەند پەندێک، بە ئەلفابێی کلدانی (سریانی / ڕۆهەڵاتی). قەبارەکەی: ٢٣ بە ١٦ سم، حەقدە پەڕاوە، هەر پەڕاوێکی ١٩ دێڕە. لە ١٨ی ئابی ١٨٨٨ لە ئەرادن لەلایەن ئێلیا هەمۆ ئەلئەلقوشی نووسراوەتەوە. دووەمیان: ڕێزمانی کوردی و تەرجەمەی چەند بەشێکی ئینجیل و چەند نامەیەکی مار پۆڵس، لەگەڵ قاموسێک، نووسرای: قەشە ئەبلحەد (هەردووکیان ٧ پەڕاون). قەشە ئەلشەماس ئێلیا هەمۆ ئەلئەلقوشی نووسیویەتیەوە.

### ١٩٥٨-١٨٩٠

عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، شاعیری یەکەم شانۆنامەنووس

### ١٨٩٥ -١٨٩٠

دەنگخۆش و مەقامزانەکان: عەلی کۆر (١٨٦٥– ١٩٣٨)، وەلی چایچی (١٨٦٤– ١٩٣٦)..

### ١٩٦٣ - ١٨٩٠

ئەحمەد موخلیس (ناڵبەند)، گەورەترین شاعیری (ئێرۆتیک)ی کورد، یەکەم شاعیری کورد خۆی کوشتبێ.

### ١٩٦٢ـ١٨٩٠

عەبدولخالق ئەسیری، کەرکووک

**١٩٠٦**

- ڕەزوان پاشا سەرۆک شارەوانیی ئەستەمبوڵ لە (١٩٠٦)، دوای ئەوەی تیرۆر دەکرێ، سوڵتان بە بیانووی ئەوەی کە کورد کوشتوویانە، (١٠٧) کوردی ئەستەمبوڵ حەپس دەکات و ئنجا دووریان دەخاتەوە.

- باوکی سمکۆ ئاغای شکاک لە ١٩٠٦ بەمەلاوە ئاوارەی ئەستەمبوڵ بووە.

**١٩٠٧**

کۆنگرەی ئیتیحادییەکان (تورکە لاوەکان) لە پاریس: بەڵێنی خودموختاری دەدەنە کورد.

- لە ماوەی ١٩٠٧- ١٩١٢: ڕاپەڕینی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی.

- باوکی شەریف پاشا، سەعید پاشای خەندان، دەکرێتە سەرۆکی شووراى دەوڵەتی عوسمانی. لە کاتێکدا پلەی شەریف پاشاش دەگاتە پلەی فەریقی یەکەم.

**١٩٠٨**

کودەتای کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی (تورکە لاوەکان) بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا. مانگی ١٩٠٨/١٢: حکوومەتی ئیتحادییەکان، ڕێکخراوە کوردییەکەی (کورد تعاون و ترقی جمعیەتی) دادەخات، دکتاتۆرییەتێکی سەختیش دەچەسپێنێتە سەر ئازادی و مافەکانی گەلی کورد. جەنەڕاڵ شەریف پاشا، کە تا ئەم ساڵەش خۆی بە ئەندامێکی ئیتحادییەکان دەزانی، سەبارەت بەم هەڵوێستە تۆرانچێتییە دەرهەق بەکورد، لێیان هەڵدەگەڕێتەوە و دژیان دەوەستێ.

- نەخشەی کوردستانی گەورە لەلایەن (مارک سایکس) دروست دەکرێ.

**١٩ / ٩ / ١٩٠٨**

ڕێکخراوی «کوردستان تەعالی و عەزمی قەوی جەمعیەتی» شەریف پاشا و عەبدولقادر شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان لە ئەستەمبول دایان مەزراند. هەندێ مێژوونووس



**١٨٩١ ـ ١٩٨٢**

حامید ئامێدی (مووسا عەزمی دیاربەکری)، خۆشنووسێکی هونەرمەند بووە.

**١٨٩٢**

- کوردناسی فەڕەنسی (لۆکۆنت دوشۆلێت) لە ساڵی (١٨٩٢)دا کامێرای لەگەڵ خۆی هێناوەتە کوردستان.

- هەندێک لە سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان لە (١٨٩١) کۆ دەبنەوە و دەچنە ئەستەمبوڵ؛ سوارەی حەمیدییە پێک دەهێنن.. ئنجا لە (١٨٩٣) سوڵتان عەبدولحەمید پێشوازییان لێ دەکات و میداڵیان بە بەرۆکەوە دەکا.

- قوتابخانەی عەشایەرییە لە ١٨٩٢ لە ئەستەمبوڵ کراوەتەوە کە منداڵە کوردیش لەوێ دەیانخوێند.

- جەمال پاشای کورد پاشای قشڵەی سەلیمیە بووە لە ئەستەمبوڵ لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمدا.

- تورکەکان بۆ چاوترساندنی کورد قوتابخانەی (عەشرەت مەکتەبی) لە ئەستەمبوڵ دادەخەن کە منداڵانی گەورەپیاوانی کورد تێیدا دەیانخوێند.

- فەرهەنگێکی کوردی - عەرەبی لە ئەستەمبوڵ لەلایەن خەلیل خەیاڵی.

**١٨٩٢ - ١٩٥٩**

شێخ سەلامی شاعیر

**١٨٩٣**

فەرهەنگەکەی (یوسف ضیاء الدین باشا الخالدي المقدسي: الهدية الحميدية في اللغة الكردية) لە ئەستەمبوڵ، لەگەڵیدا فەرهەنگی نۆباری ئەحمەدی خانی کە لە ١٦٨٢ ـ ١٦٨٣ بۆ منداڵان نووسراوە.

- ڕەشید زەکی کابان (١٨٦٧-١٩٤٠) کە خۆی دەرچووی قوتابخانەی ڕوشدیەی سلێمانی بووە، پاش تەواوکردنی ئێعدادی عەسکەری لە بەغدا و دانشگای سوپایی لە ئەستەمبوڵ، بووەتە مودیر.

وای بۆ دەچن کە ناوی (کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی) بووە. رۆژنامەیەکیان لە ١٩٠٨ بڵاو دەکردەوە بە ناوی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی)؛ پیرەمێرد سەرۆک نووسینی بوو؛ سەعید نەورەسی و عەبدوڵا جەودەت و ئیسماعیل حەقی بابان و چەندان نووسەری تر لەو گۆوارەدا دەیاننووسی. لە ٥ی٢ی ئەیلوولی هەمان ساڵ یانەیەکی رۆشنبیریی کوردیی کردەوە.

## ١٩٠٨/٩/٢٥

شەریف پاشا، لە ئەستەمبوڵ، لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و داماو ئەحمەد و زولکەفەل پاشا... کۆمەڵەی (کورد تەعالی و تەرەقی جەمعیەتی) دادەمەزرێنن. لە هەمان رۆژدا یانەی کۆمەڵەکەش لە ئەستەمبوڵ دەکرێتەوە و نوێنەری شاری مووش، رەشید بەگ، وتاری کردنەوەی یانەکەی تێدا دەخوێنێتەوە.

## ١٩٠٩/١





## ١٨٩٥

بڵاوکردنەوەی کتێبی (مەسحەفا رەش) و (جیلوە)ی یەزیدییەکان لەلایەن مسیۆنێری ئینگلیز، نۆ. باری. پاشان (براون) وەری دەگێرێتە سەر ئینگیزی.

## ١٩٦٦ - ١٨٩٥

مامەند کەرکووکی.

## ١٩٧٨ -١٨٩٥

کامەران بەدرخان.

## ١٨٩٦

ئەمین فەیزی: نووسینی «ئەنجوومەنی ئەدیبان»، کتێبێکی گرینگی پەخشان و وتار و رەخنە، کە لە (١٩٢١) بڵاو دەبێتەوە. ئەمین فەیزی، کە لە کۆتاییی سەدەی ١٩مدا لە ئەستەمبوڵ کۆڵۆنێل بووە، لە «ئەنجوومەنی ئەدیبان»دا کە یەکەمین ئەنتۆلۆجیا و کتێبی رەخنەی شیعرییە. لەبارەی نالییەوە دەڵێ: «زەکای نالی ئینکار ناکری، لاکین ئەوەندەی سەنایعی لەفظیەی ئیستیعمال کردووە، پیاو رەنگە بڵێ: شیعری نەو نەتیجەی عیلم و ئیشتیغالە». لەبارەی مەولەوی دەڵێ: «مەسلەکی مەولەوی مەسلەکی زوهد و تەقوایە، لەگەڵ ئەوەش شاعرێک بووە بێ نەزیر. مەولەوی هیچ چاوی بە شیعری فەرەنگ نەکەوتووە، لەگەڵ ئەوەش لەسەر ئوسلووبی ئەوان شیعری (نەظم) کردووە. ئەم ئوسووڵە خیلافی ئوسووڵی شوعەرای ئێرانە. لە مابەینی شوعەرای کوردا مەولەوی موقابل بە (نیظامی)یە.

## ١٩٥٠ -١٨٩٦

مستەفا شەوقی قازی زادە، شاعیری سابلاغ، لە ئەستەمبۆڵ ژیاوە.

## ١٩٥٨ -١٨٩٦

شێخ نووری شێخ ساڵح، یەکێک لەوانەی رچەی شیعری کلاسیک دەشکێنێت.

## ١٨٩٧

- حاجی قادری کۆیی کۆچی دوایی دەکات و پیرەمێردی شاعیر، لەگەڵ شاندێکی بنەماڵەی (باوکی) شێخ مەحموود، دەکاتە ئەستەمبوڵ؛ لەو کاتەدا ئەدەبی تورکی خەریکە هەنگاو دەنێ بەردو خۆ تازەکردنەوە.

پیرەمێرد، لە ئەستەمبوڵ هاورێ و دراوسێی دوو کەڵەنووسەری رێبەری ئەم بزووتنەوە ئەدەبییەی تورکیا بووە: ئەکرەم رەجایی زادە (سەرنووسەری گۆواری ثروت فنون ١٨٩٦-١٩٠١)، هەروەها خالید زیا عوششاقی زادە، کە هەردووکیان لە یەک ئاپارتماندا، لەگەڵ پیرەمێرد ژیاون. پیرەمێرد لەم بارەوە دەڵێ: «کەوتمە بەهەشتی سەروەتی فنوونەوە». ئنجا لەبارەی رۆڵی ئەستەمبوڵی ئەو کاتەوە دەڵێ: «ئێمە، زۆرترمان، لەوێوە پێگەیشتووین».

## ١٨٩٧-١٩٣٥

ئەحمەد موختار بەگی جاف

## ١٨٩٧-١٨٩٩

د. عەبدوڵا جەودەت و د. ئیسحاق سکووتی، کە دامەزرێنی رێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی) بوون و لەدەست زەبروزەنگی سوڵتان عەبدولحەمیددا رایان کردبوو، خۆیان گەیاندبوو جنێف: لەوێ دوو رۆژنامەیان بە زمانی عوسمانی دەردەکرد: عوسمانلی (١٨٩٧-١٩٠٤). دووەمیان اجتهاد (١٩٠٤). لەگەڵ رۆژنامەیەکی تر بە فەرەنسی Osmanli (١٨٩٧-١٨٩٩) کە پاشکۆی (عوسمانلی) بوو؛ ساڵێک پێش (کوردستان) بڵاو کراونەتەوە و دەبن بە یەکەمین رۆژنامە کە کورد بە زمانی بێگانە بڵاوی کردبێتەوە. ئەم دوو رووناکبیرە لە سویسرا، هاوکارییان هەبوو بۆ رۆژنامەی (کوردستان).

## ١٨٩٨

ئارشیمادریت کۆمیتاس Comitas: ئاوازە کوردییەکان Melodies Kurde، ئیتاڵیا، توێژینەوەیەکە بە زمانی فەرەنسی لەبارەی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی، هەروەها (١٢) نۆتەی سێزدە گۆرانیی کوردیشی تێدایە.



مەحوی

دەروازەی سێیەم

# کرنۆلۆجیای کوردستان

١٨٩٨- ١٩٣٢



مۆسیقاژەنەکانی کوردستانی ئێران، ساڵانی ١٨٠٠

میانه و پێوەندیی نێوان جەنەڕاڵ شەریف پاشا و سەرکردایەتیی حکوومەتی ئیتحاد و تەرەقی، بەتەواوەتی تێک دەچێ: لەسەر ئەوەی کە ئیتحادییەکان رازی نابن شەریف پاشا ببێتە باڵوێزی دەوڵەتی تورکیا لە پاریس.

١٩٠٩/٢: جەنەڕاڵ شەریف پاشا دەگاتە پاریس خۆی و خێزان و دوو کچەکەی. لە ناوەڕاستی ١٩٠٩ حزبێک بە ناوی حزبی رادیکاڵی عوسمانی دژ بە حکوومەتی ئیتحادییەکانی تورکیا، لە شاری پاریس دادەمەزرێنێ.

١٥/١٠/١٩٠٩: جەنەڕاڵ شەریف پاشا گۆوارێک بە ناوی مەشرووتیەت کە ئۆرگانی حزبەکەی خۆیەتی، لە پاریس بڵاو دەکاتەوە کە تا مانگی شوباتی (١٩١٤) بەردەوام دەبێ و (٥٥) ژمارەی لێ بە زمانی فەرەنسی بڵاو دەکاتەوە.

### ١٩١٠-١٩١٤

جەنەڕاڵ شەریف پاشا پێوەندییەکی بەردەوام و پتەوی، لە پاریسەوە، هەبووە لەگەڵ (جەمعیەت) و (کلووب) و (شەخسیات) و رێکخراوە نهێنییەکانی کوردستان، بەتایبەتیش لەگەڵ ئەوانی ئەستەمبوڵ و قاهیرە و جنێف. (مەسەلەی کورد) لە رێگەی گۆوارەکەی شەریف پاشاوە دەگاتە ئاستی گفتوگۆی دیپلۆماسی و نێودەوڵەتی.

### ١٩١٢

لە ئەستەمبوڵ لە ١٩١٢ یەکەم رێکخراوی خوێندکارانی کورد لە ئەستەمبوڵ، کە پێشتر لە ١٩١٠/١/١٠ دامەزرابوو، مۆڵەت وەردەگرێ. محەمەد شوکری سەگبان پێویستییە دارایییەکانی مەیسەر دەکرد. عومەر جەمیل پاشا سکرتێری هێڤی بوو. لقی یەکەمی لە ئەرزەڕۆم لەلایەن تەیب عەلییەوە کرایەوە (لە شۆڕشی شێخ سەعید بەشداری دەکا و دەبێتە خۆیبوون). گۆواری (رۆژی کورد) لە ١٩١٣ بڵاو دەکەنەوە، کە یەکەم گۆوارە بۆ یەکەم جار وێنەی فۆتۆگرافیی بڵاو کردبێتەوە: ئنجا لە ١٩١٤ هەر لە ئەستەمبوڵ گۆواری هەتاوی کورد.

### ١٩١٢-١٩١٤

کۆمەڵەی ئیستیخلاسی کوردستان لە ورمێ لە ساڵی ١٩١٢،

### ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨

- میقداد مەدحەت بەدرخان کە یەکێک بوو لە ئەندامەکانی رێکخراوی (ئیتیحاد و تەرەقی): لە قاهیرە، بڵاوکردنەوەی یەکەم رۆژنامە بە زمانی کوردی لە مێژوودا (کوردستان).
- چاپخانەی (کوردستان) لە قاهیرە، لەلایەن میقداد - مەدحەت بەدرخانەوە، کە دەبێتە یەکەمین چاپخانەی کورد و تەنیا دوو ژمارەی ٤ و ٥ی رۆژنامەی کوردستانی پێ چاپ دەکرێ.
- لە ١٨٩٨ سوڵتانی عوسمانی لە ئەستەمبوڵ هەڕەشە لە میقداد مەدحەت بەدرخان دەکا: ئەگەر رۆژنامە کوردییەکەت دانەخەیت ماڵ و منداڵ و موڵک و ماڵت هەمووی دەخەینە ژێر دەستی خۆمان.
- حاجی قادری کۆیی یەکەم شیعری، لە ساڵی ١٨٩٨، لە ژمارە (٣)ی رۆژنامەی کوردستان بە ناونیشانی (زەمانە) بڵاو دەکرێتەوە. پاشان وردە وردە، تا ساڵی ١٩٢٥، لە (دیاریی کوردستان، تێگەیشتنی راستی، رۆژی کورد، هەتاوی کورد، ژین، ژیانەوە) ١٩ شیعری حاجی بڵاو دەکرێنەوە: کاریگەرییان دەبێ بەسەر تازەبوونەوەی شیعری.

### ١٨٩٩

لەسەر داوای ئەشرافی سلێمانی مەکتەبی ئەعدادی لە سلێمانی کراوەتەوە.
- مەم و زین، بە پەخشان و شیعرە، لەگەڵ چەند بەیتێکی تری کوردی بە دیالێکتی کرمانجی. رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی، مارتن هارتمان Martin HARTIMANN (١٨٥١ _ ١٩١٩) کۆی کردووەتەوە.
- لەدایکبوونی قانیع (١٨٩٩- ١٩٦٥)

### ١٩٠٠

سەید مەردان (١٨٧٤- ١٩٥٢) گۆرانیبێژی کوردی کەرکووک.
- زێوەر دەگاتە ئەستەمبوڵ و چوار ساڵ لەناو ژیانی ئەدەبیی ئەوێ بەسەر دەبات و دەکەوێتە ژێر کاریگەریەتیی

لەلایەن سەید عەبدوڵای کوڕی شێخ عوبێدڵای نەهری، بە هاوکاریی سەید تەهای نەهری و سمکۆ ئاغای شکاک دامەزراوە.

## ١٩١٣

- راپەڕینی سمکۆی شکاک لە کوردستانی ئێراندا.
- جەنەراڵ شەریف پاشا لە ژمارە (٤٧)ی گۆوارەکەیدا نامەیەکی پیرۆزبایی بەفەرەنسی بەبۆنەی دامەزراندنی (جەمعیەتی هیوای طەلەبەی کوردان) و گۆواری (رۆژی کورد) بڵاو دەکاتەوە، داوا لە کورد دەکا کە خەبات بەوتر بکەن بۆ ئەوەی «لەدەست بەڵای ئیتیحاد و تەرەقی رزگارمان بێ».

## ١٩١٤



مۆسیقاژەنێکی نابینای بەزیدی
مستر ریچ لە ١٨٢٠ دروستی کردووە



شاعیرە تورکەکان، سروود دادەهێنێ.

- لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لە کوردستان، بەپێی سجللاتی کۆن، وانەی لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و ئال نیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت دەخوێنرا.
- سەعید سدقی حەسەن کابان مامۆستای قوتابخانەی نموونەی ئیبتیدائی بوو.
- سەعید پاشای خەندان، باوکی جەنەراڵ شەریف پاشا، جێگری سەرۆکی پەرلەمانی عوسمانی بووە.
- زێوەر دەگاتە ئەستەمبوڵ و چوار ساڵ لەناو ژیانی ئەدەبیی ئەوێ بەسەر دەبات و دەکەوێتە ژێر کاریگەریەتیی شاعیرە تورکەکان.

## ١٩٠٢

وەرگێڕانی «دقائق الاخبار في ذكر الجنة و النار» دقائق الاخبار، لە عەرەبییەوە بۆ کوردی «هەورامی». دیار نییە کێ تەرجەمەی کردووە. لە ساڵی (١٩٠٢) نووسراوەتەوە. (١٢١) لاپەڕەیە.

- ساڵح زەکی ساحب قران بۆ خوێندنی سەربازی چووە ئەستەمبوڵ.
- ئەمین زەکی بەگ (١٨٨٠-١٩٤٨) مەکتەبی روشدی مەلەکی و پاشان روشدیەی عەسکەریی لە سلێمانی، ئنجا ئەعدادی عەسکەریی بەغدای تەواو کردووە. پاشان لە ١٩٠٢ لە ئەستەمبول مەکتەبی ئەرکانی حەربیی تەواو کرد. بۆ ماوەی ساڵێکیش لە ١٩١٣دا، لەگەڵ چەند زابتێک، نێردرا بۆ خوێندن لە فەرەنسا. لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٠-١٩٣٠دا یەک بەدوای یەک چەندان وەزارەتی گرتووەتە دەست. لە ٣٠ی مایسی ١٩٣٠دا ئەندامی دامەزرێنی بانەی سەرکەوتن بووە لە بەغدا.
- لەدایکبوونی رەمزی مەلا مارف (١٩٠٢- ١٩٥٧؟)

## ١٩٠٣

کوردناسی ئەڵمانی لۆکۆک، کتێبێکی دوو بەرگیی، لە بەرلین بڵاو کردووەتەوە کە پڕە لە چیرۆک و تێکستی جۆراوجۆر بە زمانی کوردیی دیالێکتی کرمانجی بە پیتی عەرەبی و

لاتینی، بە تەرجومەی ئەڵمانییەوە بڵاو کردووەتەوە. فەرهەنگۆکێکی بۆ وشە گرانەکان کردووە: زازایی ـ کوردیی بابانی ـ ئەڵمانی.

– لەدایکبوونی جگەرخوێن (۱۹۰۳- ۱۹۸٤)

## ۱۹۰٤

رووناکبیری کورد، د. عەبدوڵا جەودەت ۱۸٦۹- ۱۹۳۲ چاپخانەی (ئیجتیهاد) دادەمەزرێنێ. کاتێ لە دووردەوڵاتدا ژیاوە لە جنێڤ، لە رۆژی ۱۹۰٤/۸/٤ یەکەم ژمارەی گۆواری (اجتهاد) بەو چاپخانەیەی خۆی بڵاو دەکاتەوە، پرۆژەی بڵاوکردنەوەی زنجیرە کتێبێکیش دەگرێتە ئەستۆ، بە زمانی تورکیی عوسمانلی و فەرەنسی، کە تا رۆژی مردنیشی هەر مابوو. چەندان گۆوار و بڵاوکراوە و رۆژنامە و کتێب بۆ کورد و تورک، هەر بەم چاپخانەیە بڵاو دەکاتەوە.

– سەعید سدقی حەسەن کابان مامۆستای قوتابخانەی مەحموودیە بووە.

– دیوانی مەلای جەزیری، لە بەرلین لەلایەن کوردناسێکەوە چاپ دەکرێ.

– لەدایکبوونی گۆران (۱۹۰٤- ۱۹٦۲)

## ۱۹۰۵

یەکەم شانۆگەری لە کوردستانی عێراقدا، لە هەولێر، بە ناونیشانی (میری دیل).

– نۆسکارمان: توحفەی مظفریە، ۲۰۲ لاپەرەیە. کۆمەڵێک چیرۆک و بەیتی کوردین، بە شیعر، زۆریشیان بە پەخشان، لە ۱۹۰۳-۱۹۰٤ بە دیالێکتی موکری، بۆ نۆسکارمانی ئەڵمانی تۆمار کراون. لەلایەن هێمنی موکریانییەوە هەڵگێردراوەتە سەر رێنووسی ئەمرۆی کوردی.

– لەدایکبوونی عوسمان سەبری (۱۹۰۵- ۱۹۹۳)

– لەدایکبوونی بێکەس (۱۹۰۵ ـ ۱۹٤۸)

– دەفژەن و مەقامزانە ناودارەکانی هەولێر: دەروێش مجۆڵ (۱۸۷۲- ۱۹٤۰)، مەلا نادری سەعاتچی (۱۸۷۷- ۱۹٤٤).

شێخ سەعیدی پیران



تێکۆشەری شۆڕشی ئارارات

## ١٩٠٦- ١٩٠٧

ڕۆژهەلاتناسی فەرەنسی، یۆژین یۆبین هاتووەتە مهاباد لای رشید الملک حاکمی مهاباد، بانگهێشت کراوە بۆ کۆنسێرتێکی مۆسیقا و گۆرانیی کوردی کە تێیدا سەعید و حەمەدەمین ناوێک گۆرانییان گوتووە. مەقام و گۆرانییەکان لە شیعری نالییەوە وەرگیرابوون.

– سالح زەکی ساحێبقران (١٨٩٤: هەڵەبجە) لە ١٨٩٤ چووەتە روشدیەی سلێمانی. لە ١٩٠٣چووە بۆ ئەستەمبوڵ لە مەدرەسەی حەربیە تەواوی کردووە لە ١٩٠٦ هاتووەتەوە سلێمانی. لە حکوومەتی شێخ مەحموود کرا بە وەزیری شەڕ. لە ١٩٢٥ کۆواری دیاری کوردستانی بە تورکی و عەرەبی، کوردی بڵاو کردەوە. تەرجەمەی زۆر تێدایە. لە ١٩٣٥ کرا بە موتەسەریفی سلێمانی.

– لەدایکبوونی رەشید نەجیب (١٩٠٦– ١٩٦٨)

## ١٩٠٨

لە ڕۆژنامەی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی)، لە ئەستەمبوڵ یەکەم زنجیرە فۆتۆگراف بڵاو کراونەتەوە.

– چاپخانەی «تعاون و ترقی» ١٩٠٨ لە ئەستەمبوڵ. رووناکبیری کورد، زنار سیلۆپی (قەدری جەمیل پاشا) لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێ: «خەلیلی خەیاڵی، لەگەڵ هەندێ هاورێی رووناکبیری تری لە ساڵی ١٩٠٨ دا لە گەرەکی گیوو بەگ پاشا لە ئەستەمبوڵ کۆمەڵێکیان دامەزراند بە ناوی «جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی» پاشان چاپخانەیەکیشیان بۆ بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەکەیان دامەزراند».

– کورد تەعاون جەمعیەتی، ئامانجی: دامەزراندنی دەوڵەتی کورد بوو. سەرۆک: (سید عبدالقادر سید عبدالله شەمزینی)، جێگر: ئەمین عالی بەدرخان و فەریق فوئاد پاشا. نووسەری گشتی: فەریق ئەحمەد پاشا. ئەندامان: محەمەد شوکری سەگبان، محەمەد عەلی بەدرخان، شوکری بابانزادە، شەفیق ئارواسلی، فوئاد بابانزادە، فەتحوڵا ئەفەندی، محەمەد ئەمین بێگ سلێمانیەلی.

– کۆمەڵەی نەشری مەعاریفی کوردی لە ئەستەمبوڵ



SULTAN ABDOUL HAMID HAN II



دادەمـەزرێت و خوێندنگەیەک بۆ منداڵانی کـورد لە ناوچەی (چەنبەرلی تاش) دروست دەکا.

- خـەلیلی خـەیاڵی، لەگەڵ هەندێ هـاورێی رووناکبیـری تری، لە گەڕەکی کیوو بەگ پاشا لە ئەستەمبوڵ کۆمەڵێکیان دامەزراند بە ناوی «جـەمعیـەتی تەعاون و تەرەقی» پاشـان چاپخـانەیەکیـشیـان بۆ بڵاوکـراوەکـانی کـۆمـەڵەکـەیان دامەزراند کە کۆمەڵێک کتێبی رێزمانی و قوتابخانەییان پێ چاپ کرد.

- رۆژنامـەی کـورد تـەعـاون و تەرەقی غـەزەتەسی، بە کوردی و تورکی، لە ئەستەمبوڵ. پیرەمێرد سەرنووسەرە.

- پیرەمـێرد یەکەمـین شاعیری کوردە کە شیعری خـۆی لەژێر کـاریگـەریەتیی تورکـە گـەنجـەکـاندا بنووسێ و بڵاو بکاتەوە: یەکەم نووسین و یەکەم دوو شیـعری پیرەمێرد لە ژمارە ١ و ٢ ی رۆژنامەی کورد لە ١٩٠٨ لە ئەستەمبوڵ بڵاو کراونەتەوە.

- لەدایکبوونی بەختیار زێوەر (١٩٠٨- ١٩٥٢)

- سـەعـیـد نەورەسی (١٨٧٦- ١٩٦٠) لە ئەسـتـەمـبـوڵ ژیاوە.

- مـحـمـد شـەفـیق ئەرواسی زادە (١٨٨٤- ١٩٧٠) سـاڵانێکی زۆر لە ئەسـتـەمـبـوڵ موفـتی و سـەرۆک لیژنەی پێداچوونەوەی بە قورئان بووە.

- ئەمین عالی بەدرخـان (١٨٥١- ١٩٢٦) لە ئەسـتـەمبوڵ پشکنەری دادوەری بووە.

- خـەلیل خـەیالی خـەڵکی قـەزای مـووتکیی بەتلیسـە لە عەشیرەتی مۆدان. سەعید نەورەسی دەڵێ: خەلیل خەیالی دانەری سـەرف و نەحوو و ئەلف و بێیە کە بناخەی زمانە. قـامـووسـێکی نووسـیـبـوو، دابوویە زیا گـۆکـالپ. زیا لە سـەرەتادا لە ئـەسـتـەمـبـوڵ لەسـەر بیـروڕای کـوردایەتی دەرکـــرابوو. پاشـــان زیا لە ١٩٠٨ لە کـــۆنگرەی لاوە تورکـەکـاندا وەک نوێنەری دیاربـەکـر بەشـداریی کـرد، لەو کۆنگرەیەدا بیروڕاکانی گۆڕان و بووە تۆرانی. قامووسەکەی خـەلیل خـەیالیشی سووتاند. پێشـتـر گـەلێک نووسـراوی نووسـیـبـوو وەک (لێکۆڵینەوەیەکی کـۆمـەڵایەتی لەبارەی عەشیرەتە کوردەکان.)

## ١٩٠٩

کورد نەشری مەعاریف جەمعیەتی لە ئەستەمبوڵ دامەزرا، کتێبی قوتابخانەیی و ڕێزمانی کوردییان چاپ دەکرد و قوتابخانەیەکی کوردییان بەناوی (کورد نموونە مەکتەب ئیپتیدائیسی - مەشرووتیەت) لە ساڵی ١٩٠٩-١٩١٠ لە ئەستەمبوڵ دامەزراند. خەلیل خەیالی بەڕێوەبەر، ئەحمەد کوردیزادە و سەعید نەورەسی مامۆستای ئەو قوتابخانەیە بوونە.

- یانەی بتلیس داخرا

## ١٩١٠

قوتابخانەیەکی تر لە ئەستەمبوڵ لە گەڕەکی دیوانلی دادەمەرزێ، عەبدولڕەحمان بەدرخان مامۆستا بووە و مانگی ٣٠ لیرەی عوسمانلی لە باخەڵی خۆی لە خەرجیی ئەو قوتابخانەیە سەرف کردووە.

- یەکەم دەستگای سینەما، کە بە پیل ئیشی دەکرد، هاتە سلێمانی؛ لە خانی شێخ ئەحمەد دامەزرا. خەڵک بە شەو دەچوونە سەیرکردنی.

- ئەحمەد ڕامزی زادە (ئەحمەد ڕامزی لیجەیی)، خاوەن کتێبخانەی ئیجتیهاد، لە (١٩١٠) دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی مەشرووتیەت لە ئەستەمبوڵ. نووسەر و کەسایەتییەکی تری کوردی ئەستەمبوڵە.



د. عەبدوڵلا جەودەت

## ١٩١١

ڕووناکبیری کورد، د. عەبدوڵا جەودەت ١٨٦٩- ١٩٣٢، دوای لەناوچوونی سوڵتان عەبدولحەمید و ڕاگەیاندنی شۆڕشی مەشرووطە ١٩٠٨، گەڕایەوە ئەستەمبول و چاپخانەکەی خۆی بە ناوی (اجتهاد) برد بۆ ئەستەمبوڵ؛ لە ڕۆژی ١٩١١/٦/١٤ بەملاوە دەستی کردە سەرلەنوێ بڵاوکردنەوەی کۆواری ئیجتیهاد و ژمارە ٢٤ی دەرکرد. ئەم چاپخانەیە چەندان کتێب و چاپەمەنی نووسەرە کوردەکانی سەرەتای ئەم سەدەیەی بە زمانی عوسمانلی لە بارەی کولتووری کورد بە چاپ گەیاندووە، هەروەها چەندان ڕۆژنامە و کۆواری کوردیی تریش چ بە زمانی

تورکی چ بە زمانی کورد لەم چاپخانەیەی ئیجتیهادی رۆڵەی کورد، عەبدولا جەودەتەوە چاویان بە ژیان هەڵێناوە، لەوانە بۆ نموونە: ژمارە دووی کۆواری (رۆژی کورد) لە ساڵی ١٩١٣.

- خاڵندەفەندی (١٨٤١ سلێمانی- ١٩٢٧) کە لە هەولێر تەجویدی دەگوتەوە. لە ١٩١١ دەگەڕێتەوە سلێمانی. بۆیە مەلا فەندی لە کەرکووک، لە تازیەکەی شێخ ڕەزا چاوی بە سەید مەردان دەکەوێ، داوای لێ دەکا لە جیاتی خاڵندەفەندی بێتە مزگەوتەکەی و دەرس بڵێتەوە. ئیتر شەهابە دەبێتە شاگردی سەید مەردان.

- سەید مەردان لە تەکیەی کەرکووک برادەری شێخ ڕەزا بووە. لە ١٩١٢ دوای مردنی شێخ ڕەزا دێتە هەولێر، دەبێتە مامۆستای شەهابە.

- چاپخانەی (الحوادث) لە کەرکووک

**١٩١١- ١٩٧٢**

قەدریجان

**١٩١١- ١٩٤٦**

وەزیری نادری

**١٩١١- ١٩٨٨**

نەخۆل

**١٩١١- ١٩١٣**

مستەفا شەوقی دەچێتە ئەستەمبوڵ؛ لە ١٩٢٢ خوێندنی پزیشکی لە ئەستەمبوڵ تەواو دەکات.

- ڕۆژنامەی (کوردستان مشنێری Kurdistan Missionary، ژمارە (١) لە مانگی ئەڤریلی ١٩١١ بڵاو دەکرێتەوە کە ئۆرگانی موژدەکارەکانی (مسیۆنێرەکانی) دانیشتووی کوردستانی ئێرانە، بە زمانی ئینگلیزی و چەند لاپەڕەیەکیش بە کوردی. باس و خواس و دەنگوباسی کوردستانی ئێرانمان بۆ دەگێڕێتەوە لەگەڵ جار جار وتار و توێژینەوە و شیکردنەوە لەبارەی ئەحوالی خەڵک و حکوومەتەکانی ئێران و عوسمانی. تا ساڵی (١٩٢٦)یش



خۆپیشاندان دژی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩٠٨

هەر بەردەوام بووە. مسیۆنێری ئەمەریکایی، لۆدڤیگ ئۆڵسن فـاسـۆم L. O. Fossom ، لە ژمـارە (٦)ی ڕۆژنـامـەی کـوردسـتـان مـیـشنێری، سـاڵی (١)، لە مـارسی (١٩١١) وتارێکی گرینگی نووسیوە.

## ١٩١٢

دەرکەوتنی چالاکی و گۆرانییەکانی کاوێس ئاغا (١٨٨٩-١٩٣٦) و سێوە (١٨٩١- ١٩٦٣).

- یەکەمین وێنەگری کورد کە لە کوردستاندا ستۆدیۆی وێنەگرتنی دامەزراندبێت و هونەری فۆتۆی لەناو کورداندا بڵاو کردبێتەوە و وێنەگرتنی کردبێتە پیشەیەک بۆ خۆی، بریتییە لە (محەمەد یووسف سدیق غەزنەوی ١٨٩٤-١٩٦٤) کە خەڵکی شاری ئاکرێ بووە و ستۆدیۆیەکی وێنەگرتنی لەوێ کـردووەتەوە. یەکـەم وێنەکـانی لە نێـوان سـاڵانی (١٩١٢- ١٩٢٠) لە بادیناندا گرتووە.

## ١٩١٢- ١٩١٣

مـیقداد- مـەدحەت دەکـەن بە مـوتەسـەریفی (پارێزگـاری) شاری دەرسیم.

- لە سـاڵی (١٩١٢) بڵاوکردنەوەی کـتـێـبی (شـیـعـری ڕۆحـانی) بە زمـانی کـوردی، کـە بە دەست نووسـراوەتەوە، بریتییە لە (١١) سرووودی مەسیحی. لە دوو ساڵ پێشترەوە لە مـهاباد و دەوروبەری، لە بۆنە دینییە مـەسیحییـەکاندا دەگوترانەوە. مسیۆنێری ئەمریکایی، لۆدڤیگ ئۆڵسن فاسۆم L. O. Fossom سەرپەرشتیی نووسین و چاپەکەی کردبوو.

## ١٩١٣

یەکـەمین ڕێکخـراوی خـوێندکـاران بە نـاوی (هێـڤی - جـەمعیـەی تەڵەبەی کوردان) کە پێشتـر لە ١٩١٠/١/١٠ دامەزرابوو، بەڵام لە ١٩١٢ مۆڵەت وەردەگرێ؛ گۆواری ڕۆژی کـورد لە ئەسـتـەمـبوڵ دەردەکەن. بەشـە تورکـیـیـەکـەی، د. عـەبدوڵا جـەودەت و ئیسـمـاعیل بابان و مـەمـدووح سـەلیم بەڕێوەیان دەبرد. کـوردییـەکـەش: نـەجـمـەدین حـوسـێن کرکوکلی و عەبدولکەریم سلێمانیەلی.

یەکەمین گۆواری کوردییە کە بۆ یەکەم جار (چیرۆک) و



جەنەڕاڵ شەریف پاشا لە ١٩١٩ لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس داوای دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەکات.

وێنەی فۆتۆگرافیی بڵاو کردبێتەوە. پێش ئەویش ڕۆژنامەی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی) لە ١٩٠٨ لە ئەستەمبوڵ وێنەی بڵاو کردووەتەوە.

- لە ١٩١٣/١/٤ یان لە ٢٢ی تشرینی یەکەمدا عبدالرزاق بەدرخان لە شاری (خوی) لە کوردستانی ئێران (کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردستان) یان (کۆمەڵەی جیهاندانی) دادەمەزرێنێ لەگەڵ قوتابخانەیەکی کوردی کە تێیدا ئەلف و بێی ڕووسی و ئەدەبی ڕووسی و زمانی کوردی فێری قوتابییان دەکەن. سمکۆ ئاغای شکاک هاوکاریی دەکردن.

- ئەورەحمان بەگی نفووس: نووسینی یەکەمین شیعرەکانی خۆی بە نازناوی حەزمی.

- لەدایکبوونی ئەنوەر مائی.

## ١٣-١٩١٥

دوو جار سینەمای سەفەری لەلایەن تیپی عوسمانییەکانەوە لە ڕێگەی زاخۆوە هاتووەتە هەولێر، لەسەر کالیسکەیەک دانرابوو و فیلمی سوڵتان عەبدولحەمیدی پیشان داوە، پاشان چووەتە کۆیە و سلێمانی.



لەداردانی تێکۆشەرە کوردەکان لە ١٩٢٣-١٩٢٤ لەلایەن کەمال ئەتاتورکەوە.

## شەڕی یەکەمی جیهانی

## تا ١٩١٨

- سەرەتای ١٩١٤: شەریف پاشا لە حکوومەتی ئینگلیزەکان نێزیک دەکەوێتەوە بۆ چارەکردنی کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا. لەگەڵ بیرس کۆکس، باڵوێزی بەریتانیا لە پاریس، کۆ دەبێتەوە. ئامادەیی نیشان دەدات بۆ هاوکاریکردنی حکوومەتی بەریتانیا لەبارەی نەخشەدانانێک بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا.

- ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩١٤: کۆچی دوایی سەعید پاشای خەندان، نائیبی مەجلیسی عالی لە دەوڵەتی عوسمانیدا، باوکی جەنەڕاڵ شەریف پاشا.

- شێخ عەبدولسەلام بارزانی لەسێدارە درا بەدەستی تورکەکان لە مووسڵ.

- لە ١٩١٤عوسمانییەکان دەست بەسەر موڵکی نیشتمانپەروەرەکان دادەگرن.

- کۆلۆنێل نیاس، یەکەم کونسوڵی رووسیا لە سابڵاغ، لە ١٩١٤/١٢/٢٨ لە شەڕی میاندواو کوژرا.

### ١٩١٥

لوتفی فیکری، لەگەڵ چەند رۆشنبیرێکی تری کورد پارتی موجەدید لە ئەستەمبوڵ دادەمەزرێنێ: جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و دابرانی خەلافەت لە سوڵتان.

- عوسمانییەکان هێرش دەکەنە سەر کوردە مەسیحییەکانی کوردستانی تورکیا و ئەوانیش بە کۆرەو، بە هەزاران، پەنا دەبەنە بەر کوردستانی عێراق و دەگەنە کەمپی بەعقووبە.

### ١٩١٥

- شێخ مەحموود چەندان ساڵە لەگەڵ خانەوادەکەی، لە مووسڵ دەژیت؛ دەوڵەتی عوسمانی داوا لە شێخ مەحموود دەکا کە بگەڕێتەوە سلێمانی و کورد تەیار بکا بۆ ئەوەی بەگژ هێزەکانی رووسیادا بچنەوە. شێخ مەحموود خۆی دایە پاڵ لەشکری عوسمانی، بەشداریی کرد لە شەڕ، دژی



## ١٩١٤

## شەڕی یەکەمی جیهانی

## تا ١٩١٨

١٩١٤- ١٩١٨: شەڕی یەکەمی جیهانی کاریگەرییەکی گەورە دەنوێنی بەسەر داهاتووی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی لەم ماوەیەی گواستنەوەدا.

- لە ١٩١٤ بڵاوکردنەوەی کتێبی دووەمی (شیعری رۆحانی) بە زمانی کوردی، کە بە دەست نووسراوەتەوە، برێتییە لە (٤٠) سروودی مەسیحی. لە مەهاباد و دەوروبەری، لە بۆنە دینییە مەسیحییەکاندا دەگوترانەوە. مسیۆنێری ئەمەریکایی، لۆدڤیگ ئۆلسن فاسۆم L. O. Fossom سەرپەرشتیی نووسین و چاپەکەی کردبوو.

- لە ١٩١٤ مەلا محەمەد خواهەرزاد بۆ یەکەم جار بیست بەرگ تەفسیری قورئان دەکاتە کوردی و نێوی لێ دەنێ (تەزکاری ئیمان بۆ کۆمەڵی کوردان).

- لە ١٩١٤ بەمەلاوە ژمارەی قوتابیانی ناوەندی لە سلێمانی: ١٦٣ کەس بووە.

- زۆربەی قوتابیانی کوردی هەولێری، بۆ نموونە، دەرچووانی قوتابخانەی روشدیە یا مەدارس، دەچوونە (دارالمعلمین ابتیدائی سی) و (حقووق کولیەسی) لە مووسڵ. لە سلێمانی و شارە گەورەکانی تری کوردستانیش، بەهەمان شێوە: بۆ فێربوون و خوێندن روویان دەکردە بەغدا و ئەستەمبوڵ. هەروەها، دوای کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانی، یەکەمین قوتابخانەکان بۆ کوڕان لە کوردستاندا کرانەوە. دوا بەدوای ئەو، قوتابخانە بۆ کچانیش، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا دەرگەکانیان کەوتە سەر پشت.

- کۆواری هەتاوی کورد (ئەستەمبوڵ /١٩١٤).

- لە سەفەربەللگ رەشبگیر دەگەڕێ. هەموو دووشەمەیەک لە بەردەرگەی بینایەی سەرای هەولێر لەناو قەلا مۆسیقا و مارشی دەوڵەتی عوسمانییان لێ دەدا و ئالایان بەرز دەکردەوە. شەهابەی گۆرانیبێژ (١٨٩١- ١٩٣٩) لەو تیپە بووە. شەهابە ٢٣ ساڵ دەبێ و تازە

ڕووسـیـا (کـە لەگـەڵ هـاوپەیمانەکـان بوو دژی دەوڵەتی عوسمانی).

- لە نیـسـانـی ١٩١٥ شـێخ مـەحـمـوود دیسـان بۆ لایەنگیـریکردنی دەوڵەتی عـوسـمـانی هـەزاران کـوردی کـۆ کـردەوە و چوونە شـەڕی شـوعـەیبـە لە نێـزیک بەسـرە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکری ئینگلیـز کـە دەیانویست بێن عێراق داگیر بکەن.

کاتێ ئینگلیز بەرەو عیمارە بەڕێ کەوتن، شێخ مەحموود بەخـۆی و هـەزار و پێنج سـەد کـەس کـەوتنە ڕێ بەناوی غـەزاوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان. خـەلیل پاشـای والیی عـوسـمـانی خـۆی چووبووە سـەردانی شـێخ لە سلێـمـانی و داوای لێ کردبوو. حاجی پیرداودئاغای مێرغوزاری دزەیی هەولێـر لەگـەڵ شـێخ بـوو، لەگەڵ سـەید ئەحـمـەد خـانەقـای کەرکووک برینداربوو، نامیق ئاغای گوندی حەفتەغاری دووزی سـەرۆک هـۆزی داودە شـەهیـد بوو، لەگـەڵ شـێخ جەباری شەهید.

کاتێ شێخ گەیشتبووە شەڕەکە، عجێمی پاشای کوڕی سەعدوون پاشا پێشوازیی لێ کردبوو.

## ١٩١٦

ڕێککەوتننامـەی (سـایکس پیکۆ): دابەشکردنی کـوردسـتـان بەسـەر بەریتـانیـا و فـەڕەنسـا و ڕووسـیـا. کوردستانی سووریا دەکەوێتە ژێر ئینتیدابی فەڕەنسا.

- بەهاری ١٩١٦: هێزەکانی ڕووس گەیشتنە سیدەکان و لێلکان و دۆڵی خـواکـورک و ڕایات و کـاولۆکـان، باڵەک و ڕەواندزیـشـیـان داگـیـر کـرد. بە لای دەرگـەڵە و حـاجی ئۆمەرانیـشـەوە هەر هێرشـیـان وەڕێ خسـتبـوو. خەرەندی ڕەواندز پڕ مەیتی ئەوان بوو.

- برسـێـتی و نەخـۆشی و ڕەشـبگیـر دەسـتی پێ کـرد. جەندرمـەی عوسـمـانی لە مـاڵان دەگەڕان بەزۆر زەخـیـرەی خـەڵکیـان دەبرد. خـەڵکانێکی زۆر لە گـوندەکـانی باڵەک و ڕوسـتێ و ڕەواندز و گـەڵاڵە و ناوچەکـانی ترەوە، لە ترسی ڕووس، لەلایەکی تریشـەوە لە ئەنجـامی زەبروزەنگی عـوسـمـانی لە باکـورەوە، دادەبەزنە ناو هـەولێـر و ژمـارەی دانیـشـتووانی هـەولێر بەرزتر دەبێتەوە. لە ١٩١٦ ژمارەی



دەستی کردووەتە بانگدان و سەڵا و گۆرانی و مەقامات.

- پیرەمێرد لە ١٩١٤ لە تورکیا بووە کە گۆوارێکی بانگی کوردی (بەغدا: ژ١ لە ٨/ ٢/١٩١٤، جەمال بابان و عومەر نەزمی و عـەلی کەمـال باپیـرئاغا کـاریان تێدا کـردووە) بۆ چووە و بینیـویەتی. کـاری پۆسـتـە و هـەواڵ لە بەغـداوە زوو دەگەیشتە ئەستەمبوڵ.

## ١٩١٥

حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٨٣- ١٩٤٧) چاپخانەیەکی لە ئەڵمـانیـاوە هێنایە حـەلەب، پاشان لە ١٩٢٥ گواستییەوە بۆ ڕەواندز و ئنجا لە ١٩٤٨ هێنای بۆ هـەولێر. گۆوارەکانی ڕۆناکی و زاری کرمـانجی (١٩٢٦- ١٩٣٢) و دەنگی گێـتی تازە و سەدان کتێب بەو چاپخانەیە چاپ کراون.

- حـوسـێن حـوزنی مـوکـریانی کـاتێ لە (١٩١٥)دا لە ئەڵمانیاوە دەگەڕێتەوە حەلەب، کامێرایەکی وێنەگرتن لەگەڵ خـۆی دەهـێنێت و لەناو چاپخـانەکـەی خـۆیدا لە ڕەواندز دایدەمـەزرێنێ و بۆ کـاری وێنەگـرتنی ڕۆژنامـەکـەی و بڵاوکردنەوەی وێنە لەناو کتێبان سوودی لێ وەردەگرێ.

- قـەسـری عەتاوڵاغا (عـەتاوڵاغای کوڕی حـاجی ڕەشـید ئاغا-١٨٨٢- ١٩٦٣ کە دژی بەریتانیا بووە) لە ١٩١٥ وەستا بەکری کوڕی وەستـا مـسـتـۆ دروستی کـرد. دوازدە دەرگـەی نەخشینی هەبوو. چواردەوری هەمووی ڕەز و باخ بوو.

- لە هـەولێـر، سـەید غـەریب بەرزنجی چاپخـانەی «سـەید غـەریب»ی دروست کرد، بووە بارەگای نووسەران؛ قـەوانێکی تێدابوو گۆرانیـیەکانی کاوێـس ئاغـا خان و سێوەی لێ دەدا. مەلا عـەلی کلاشدروو شـەوان هەقـایەتی کوردەواریی تێدا دەگێڕایەوە.

١٩١٥- ١٩١٦: سـەید عـەلی ئەسـغـەری کـوردسـتـانی (١٨٨٢- ١٩٣٧) گۆرانیبێژ، مەقامزان.

- لە سـاڵی ١٩١٥ بۆ یەکەم جار یەکەمین ئۆتۆمۆبێل دێتە هەولێر، عەسکەرییە ئەڵمانییەکان هێنابوویان. ترومبێلێکی سەربازیی ئەڵمانییەکانی هاوپەیمانی عوسمانییەکان بوو، هاتە ناو قـەڵا. خـەڵکی هـەولێر یەکەم جاریان بوو چاویان بە ئۆتۆمـۆبێل بکەوێت: چونکە ئەو کـاتە هـیچ کـەسـێک ئۆتۆمۆبێلی نەبوو.

دانیشتوانی قەڵای هەولێر گەیشتە دە هەزار کەس.

– خدری ئەحمەد پاشای عەشیرەتی دزەیی (١٨٨٠-١٩٨٦) لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی تر، تا ئەو کاتەی رووس لە ١٩١٧ کشانەوە، شەڕی دژی رووسیای کرد بۆ ئینگلیز.

## ١٩١٧

کۆنفرانسێک لە سنە دەبەسترێ: رووسیا بەڵێن دەدات یارمەتیی کوردەکانی ئێران بدا بۆ وەدەستهێنانی مافەکانیان.

– لەشکری ئینگلیز خانەقین داگیر دەکەن .

– لەشکری رووس لە ڕەواندزەوە وردە وردە دەکشێنەوە و



سمکۆی شکاک



## ١٩١٦

لە چارەگی یەکەمی سالانی (١٩٠٠) لە هەولێر، بەپێی سجلاتی کۆنی پەروەردەی هەولێر، وانەی " لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و نال ئیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت " دەخوێنرا. کەواتە، وانەی رەسم و هونەرە دەستییەکان بەشێک بووە لە پێداویستییەکانی خوێندن و پەروەردە.

– لە ساڵی١٩١٦ کوردستانی ئێران بەهەمان شێوە سەرەتایەکی سادە و جوانی هونەری شێوەکاریی مۆدرێرن دەستی پێ کردووە. مینۆرسکی لەناو بازاڕی مەهاباد تابلۆیەکی مۆدێرنی کڕیوە و پێشکێشی کردووە بە مەکەنزی. تابلۆیەکە وێنەی کوردێکی مەهابادییە بە جلوبەرگی کوردییەوە. لەم کتێبەدا تابلۆکەمان بڵاو کردووەتەوە.

– لە (١٩١٦– ١٩١٧): بڵاوکردنەوەی کتێبی سێیەمی (شیعری رۆحانی) بە زمانی کوردی، کە بە دەست نووسراوەتەوە، برێتییە لە (١٠٠) سروودی مەسیحی. لە مهاباد و دەوروبەری، لە بۆنە دینییە مەسیحییەکاندا دەگوترانەوە. (٤٠) سروود لە ئینگلیزییەوە تەرجەمە کراون، (٢٧) سروود لە نەرویجییەوە، (٢٢) سروود لە سوێدییەوە، (٦) لە ئەڵمانییەوە، پێنجەکەی تریش لە کوردان وەرگیرابوون. مسیۆنێری ئەمەریکایی، لۆدڤیگ ئۆلسن فاسۆم L. O. Fossom سەرپەرشتیی نووسین و تەرجەمە و چاپەکەی کردبوو.

## ١٩١٧-١٩١٨

رۆژنامەی کوردستان، خولی سێیەم، لەلایەن ثریا بەدرخانەوە (١٨٨٣-١٩٣٨)، لە ئەستەمبوڵ بڵاو کراوەتەوە.

## ١٩١٨/١/١

رۆژنامەی تێگەیشتنی راستی لە بەغدا، کە لە ژمارە ٢٣ و ٢٤دا بابەتێکی تایبەت دەداتە بیری نوێخوازی لە شیعرنووسیندا: بۆ یەکەم جار وشەی «نوێخوازی – تجدد» بەکار دەهێنێ.

کوردستان جێ دێڵن. برسێتی و نەخۆشی و شەڕ کوردستانی داگرتووە. لەشکری عوسمانی هێشتا هەر لە هەولێرە.

**١٩١٨/١٠/٢٥**

لەشکری ئینگلیز کەرکووک، پاشان مووسڵ داگیر دەکەن.

**١/١١/١٩١٨ تا ٩/١١/١٩١٨**

ئینگلیز هەولێریان بەبێ شەڕ داگیر کرد. ئەحمەد عوسمان ئەفەندی بووە سەرۆکی شارەوانی تا ١٩٢١.

**١٧/١١/١٩١٨ - ١٨/٦/١٩١٩**

حکوومەتی یەکەمی شێخ مەحموود

پێشتر، لە ١٥/١/ ١٩١٨ مێجەر نۆئێل هاتبووە سلێمانی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ شێخ مەحموود. بارودۆخی سلێمانی خراپ بوو، مێجەر نۆئێل باربوویەکی زۆری ناردە سلێمانی، بەپێی فەرمانی (ویلسۆن) ئینگلیز شێخ مەحموودی لە ١٩١٨/١١/١٧ کردە (حاکمی سلێمانی).

**١٩١٨**

– کۆمەڵەی (کوردستان تەعالی جەمعیەتی) لە ئەستەمبوڵ، کە شێخ عەبدولقادری شەمزینی سەرۆک و ئەمین عالی بەدرخان جێگر بووە. ئەندامەکانیشیان: حیکمەت بابان، مستەفا شەوقی، محەمەد میهری، هەمزە موکسی، مەمدووح سەلیم، ع. ڕەحمی هەکاری، عەزیز یاموڵکی، کەمال فەوزی.

– کۆمەڵەی (کوردستان ئیستیقلال جەمعیەتی) لە قاهیرە لەلایەن سوریا بەدرخان دامەزراوە.

– شەڕ کۆتاییی دێ: لەشکری ئینگلیز کەرکووک و پاشان مووسڵ داگیر دەکەن. مێجەر نۆئێل دەچێتە سلێمانی، شێخ مەحموود دەکەنە (حوکمداری کوردستانی عێراق). لەم ساڵەدا ژمارەی دانیشتووانی سلێمانی (١٣٢٩) کەس بووە.

– کۆلۆنێل لیچمان کرایە فەرمانداری ویلایەتی مووسڵ کە هەولێر و دهۆکیشی دەگرتەوە.

– عەبدولڕەزاق بەدرخان لە مووسڵ ئیعدام دەکرێ، سمکۆ ئاغای شکاک لە کوردستانی ئێران ناوچەکانی ورمێ لە



– لە ١٩١٨ گیوی موکریانی بایەخ بە فۆتۆگراف دەدات، بەکامێرای خۆی چەندان دیمەنی زیندووی ژیانی کوردستان و شەخسیاتی گەلەکەی خۆی، لەوانە زۆر وێنەی جۆراوجۆری هەولێر، لە فەوتان ڕزگار دەکات و دەیانگرێتە چوارچێوەی زیندووی فۆتۆگرافەوە. بەشێکی وێنە نایابەکانی شاری هەولێر لە ساڵانی (١٩١٨–١٩٥٠) بە کامێرای گیوی موکریانی گیراون.

– ئەحمەدی خانی: عەقیدا ئیمانێ، ئەستەمبوڵ.

– قوتابخانەی (سلذانیە) لە کەرکووک هەبووە.

– کۆچی دوایی (سەید ئەحمەد فائیزی بەرزنجەیی) لە ئەستەمبوڵ، خاوەن کتێبی (کنز اللسان) کە بریتییە لە یازدە ستوون و بە شەش زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی و فەرەنسی و ڕووسی و کوردی نووسراوە: بە پازدە جۆر دەخوێنرێتەوە: لە سەرەوە بۆ خوارەوە و لە چەپەوە بۆ ڕاست و هەمووشیان بەپێچەوانەشەوە.

– چاپخانەی «نجم استقبال» کە بارەگاکەی لە نزیک (بابی عالی) لە شەقامی (ابو السعود) بوو لە ئەستەمبوڵ. چەندان بڵاوکراوەی کوردیی چاپ و بڵاو کردووەتەوە: ڕۆژنامەی ژین (١٩١٨– ١٩١٩)، لەگەڵ کۆواری (کوردستان ١٩١٩– ١٩٢٠). چاپخانەی (نجم استقبال) بەردەوام لە هەموو چاپەمەنییەکانی خۆیدا بانگاشە و پروپاگەندەی بۆ کتێبە کوردی و کۆوارە کوردییەکان دەکرد. چاپی یەکەمی مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی بە پێشەکیی هەمزە بەگ، ئەویش هەر لە چاپخانەی (نجم استقبال) چاپ کراوە.

– گرووپی شاعیرانی کۆواری ژین (ئەستەمبوڵ ١٩١٨– ١٩١٩) کە پشتیان بەستبوو بە ئایدیۆلۆجییەت و سیستەمێکی تازەی بیرکردنەوە: «ئایدیۆلۆجییەتە کۆمەڵایەتی و سیاسییە کۆنەکان، ئەمرۆ، ڕوو لە هەرەسن. ئێمە ئەمڕۆ بەشداری لە سازکردنی چەند ڕچە و پرەنسیپێکی تازە دەکەین».

– کۆواری (ژین) کە لە ١٩١٨ لە ئەستەمبوڵ دەرچووە پێمان ڕادەگەیەنێ کە لە ١٩١٨ کە ژمارەی کرێکارانی کورد لە ئەستەمبوڵی ساڵی ١٩١٨ پێنج تا دە هەزار کەس بووە.

– لەدایکبوونی دڵدار (١٩١٨ ـ ١٩٤٨)

– قاسم ئەمین (١٨٦٠– ١٩٠٣) کە بە بنەچە کوردی

لەشکری ئێران پاک دەکاتەوە و شەڕ لەگەڵ لەشکری ئێران دەکا لەپێناو سەربەخۆیی نەتەوەیی.

– یانەی کوردی لە دیاربەکر لەلایەن ئەکرەم جەمیل پاشاوە.

– لقێکی جەمعیەتی تەعاون لە دیاربەکر کرایەوە و ناوی نرا یانەی کورد (کورد کلۆبی). دوکتۆر جەودەت بەگ جێگری سەرۆک بوو، کەریم جەردیس زادە ژمێریار. نزیکەی دوو هەزار ئەندامی هەبوو لەوانە محەمەد میهری و دوکتۆر فوئاد. لە کۆتاییدا رێکخراوێکی تری لێ دامەزرا بە ناوی تەشکیلاتی نیجتیماعیە؛ ئەمین عالی بەدرخان و شوکری بابانزادە و عەبدوڵا جەودەت و ئەکرەم جەمیل پاشا سەر بەم رێکخراوە بوون. گۆواری ژین ١٩١٩ ئۆرگانیان بوو.

– جەمعیەتی تەعالیی کورد کە لە ١٩١٨ لە ئەستەمبوڵ دامەزراوە، بەپێی هەندێک سەرچاوە، پازدە هەزار ئەندامی هەبووە.

– بەپێی سەرچاوەیەکی تر (٢٠٠) خوێندکاری کورد لە ساڵی ١٩١٨ لە ئەستەمبوڵ لە بەشە جیاجیاکانی پەیمانگە و زانکۆکانی ئەستەمبوڵ خوێندنیان تەواو کردووە.

## ١٩١٩

– (ویلسن)ی سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لەو رۆژانەدا چواردە بەندەکەی خۆی بڵاو کردبووەوە کە بەپێی ئەم دەستوور و بەڵگەیە- هەموو قەومێک مافی داواکردنی سەربەخۆیی پێ درابوو.

– لە ١٩١٩/٣/١: جەنەراڵ شەریف پاشا، لە پاریس، لە شەقامی مێسین لە خانووی ژمارە (٢٢)، خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەو کۆنفرانسە نێو دەوڵەتییەی کە چارەنووسی نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیاری دەکات.

– شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبەیدوڵای نەهری لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان، بە ناوی (کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان) لە ئەستەمبوڵ، لە رێگەی کۆمیسارییای ئەمەریکایی و ئینگلیزی و فەرەنسییەوە لە ئەستەمبوڵ، رادەگەیەنن کە شەریف پاشا بۆی هەیە لە کۆنفرانسە نێو دەوڵەتییەکەدا ببێتە نوێنەری داخوازییەکانی گەلی کورد.

– لە هەمان کاتدا، لە کوردستانی عێراقیشدا، شێخ



سلێمانییە و لە فەڕەنسا حقووقی تەواو کردووە و ساڵانێکی زۆر لە میسر دادوەر بووە، ماوەیەک ئەویش هاتووەتە ئەستەمبوڵ و لە ١٩١٨ کتێبە ناودارەکەی (حوڕیەتی نسوان) لەبارەی ئازادی و مافەکانی ئافرەت دەکرێتە تورکی و شۆڕەتێکی زۆر لە ئەستەمبوڵ پەیدا دەکا.

## ١٩١٩

مسیۆنێری ئەمەریکایی، لۆدڤیگ ئۆلسن فاسۆم L. O. Fos-som : کتێبی (رێزمانی کوردی لەسەر بنەوانی قسەکردنی رۆژانە لە ناوچەی سابڵاغ: A Pratical Kurdish Grammar ) لەلایەن Lutheran Orient - Mission Society بڵاو کراوەتەوە. کتێبەکە چەند چیرۆک و پەندێکیشی تێدایە بە کوردی و تەرجەمەی ئینگلیزیش کراون.

نووسەر -خۆی وتارێکی لەبارەی کتێبەکەی، لە ژمارە (٢)ی رۆژنامەی کوردستان میشنێری، ساڵی (١٢)، لە ئەڤریلی (١٩٢٠) بڵاو کردووەتەوە.

– لە مانگی گوڵانی ١٩١٩دا بۆ یەکەم جار (کۆمەڵەی پێشکەوتنی ژنانی کورد/ کورد قادینلار تعالی جمعیەتی) دادەمەزرێت لەپێناو گرێدانەوەی خەباتی ئافرەتانی کورد بە خەباتی نەتەوەییەوە. خێزانی شەریف پاشا، ئەمینە خانم (١٨٦٨– ١٩٢٦) بووەتە سەرۆکی (کۆمەڵەی تەعالیی ژنانی کورد) کە سەر بە (کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان) بووە.

– عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری، لە گۆواری ژین لە ژمارە (٢١)دا، لە لاپەڕە (١٥–١٦)دا، شیعرێک پێشکێش بە جەنەراڵ شەریف پاشا دەکات و بەناوی گەلی کوردەوە پشتگیری لە هەڵوێست و داخوازییەکانی ناوبراو دەکات و بە نوێنەری راستەقینەی گەلی کوردی لە قەڵەم دەدات.

– محەمەد شوکری سەگبان (١٨٨١– ١٩٦٠) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا رۆڵی سیاسیی هەبووە لە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورددا و رۆشنبیرێکی کوردی دیاری ئەستەمبوڵ بووە.

– لوتفی فیکری دیاربەکری (١٨٧٢: دیاربەکر– ١٩٣٤: پاریس) کە لە پاریس حقووقی تەواو کردووە و لە دوای کوودەتاکەی ١٩٠٨ لە مەجلیسی مەبعووسان بە نوێنەری دەرسیم هەڵدەبژێردرێ.

مەحموود مەزبەتەیەکی بە ئەهالی و عەشایەری کورد مۆر کرد کە بەپێی ئەمە شەریف پاشای کوردی دانیشتووی پاریس کرا بە نوێنەری کوردەکان لە (کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس) بۆ داواکردنی حقووقی قەومیی کورد.

١٩١٩/٣/٢٢: پێشکێشکردنی (یاداشتنامەیەک لەبارەی داخوازییەکانی گەلی کورد) بە زمانی فەرەنسی، ئەو یاداشتنامە ناودارەی کە تێیدا جەنەراڵ شەریف پاشا بۆ یەکەمین جار داخوازیی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەکات بۆ کورد لە کۆنفرانسی نێودەوڵەتییانەی ئاشتی کە لە پاریس بەسترا لەپێناو دیاریکردنی چارەنووسی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەم یاداشتە نەخشەیەکی کوردستانی گەورەیشی لەگەڵدا بوو. یەکەم جار کوردێک، جەنەراڵ شەریف پاشا نەخشەیەکی کوردستانی گەورە دروست دەکات و وەک ئامرازێکی دەربڕینی هەستی نەتەوەیی، لەناو داخوازینامەکەیدا بە ئەرکی دەخات.

- سەرۆکی ئەمەریکا (ولسۆن)، لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا (لوید جۆرج)، پێکرا لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی فەرەنسا (کلیمەنصۆ) لەم یاداشتنامەیە بە وردی دەکۆڵنەوە.

- ئەم هەڵوێستە گرینگ و رووداوە سیاسییە مەزنەی شەریف پاشا، لە رۆژنامە و گۆوارە کوردی و عەرەبی و ئەرمەنی و فارسی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسییەکاندا دەنگ دەداتەوە. بڕوانە گۆواری کوردستان (ئەستەمبوڵ ١٩١٩- ١٩٢٠)، ژمارەکانی (٤ . ٥ . ٦)و ؛ ژمارە(٩) (١١ی حوزەیرانی ١٩١٩) کە بەشی یەکەمی یاداشتنامەکەی بە زمانی تورکی بڵاو کردووەتەوە؛ هەروەها ژمارەکانی گۆواری ژین (ئەستەمبوڵ ١٩١٩). لە ریزی رۆژنامە تورکییەکانیش، رۆژنامەی (إقدام) (١٨٩٢- ١٩٢٠) لە زۆربەی ژمارەکانی ئەو کاتەدا بەفراوانی باسی کردووە، لەوانە: لە رۆژی (١٦ی نیسانی ١٩١٩، ٢ی شوباتی ١٩١٩)، ژمارە (٧٩٦٨)، (٧٩٢٦)، (٧٩١٦)، (٧٩٦٨)، (٧٨٩٥).

١٩١٩/٥/٢٦: شەریف پاشا برووسکەیەک بۆ سیاسەتمەدار و رووناکبیر و رێکخراوەکانی کوردستان دەکات و وەڵامیان دەداتەوە کە ئامادەیە هاوکاری لەگەڵ عارف پاشای کورد بکا بۆ پاراستنی مافە نەتەوەییەکانی



- بڵاوبوونەوەی یەکەم شانۆنامە بە زمانی کوردی (مەمێ ئالان) بە پێنووسی عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری: گۆواری ژین، ژ ١٥ و ١٦، لە ئەستەمبوڵ، ساڵی ١٩١٩. هەروەها بڵاوکردنەوەی یەکەمین دیوانە شیعری شاعیرێک کە خۆی لە ژیاندا بێ بە ناونیشانی (گازیا وەلات) لە ئەستەمبوڵ لەلایەن ع. رەحمی هەکاری، کە پێشتر بیست پارچە شیعری لە گۆواری ژین (١٩١٨/١١/٧ - ١٩١٩/١٠/٢) لە ئەستەمبوڵ بڵاو کردووەتەوە.

- سەعید نەورەسی و هەمزە بەگ و خەلیل خەیالی لە دامەزرێنەرانی (کورد تەعالی جەمعیەتی) بوون لە ئەستەمبۆڵ ساڵی ١٩١٩.

- وەرگێرانی (ئینجیل) لە چوار بەرگدا بۆ کوردیی مهابادی، لە یۆنانییەوە، لەلایەن: ئەمێریکان بایبل سۆسایەتی.

- کورد تەئمینی مەعاریف و نەشریات جەمعیەتی لە ئەستەمبوڵ.

- لە سەردەمی شێخ مەحموودا رەشید زەکی کابان (١٨٦٧ ـ ١٩٤٠ ) کە خۆی دەرچووی روشدیەی سلێمانی بووە، بووەتە مودیری قوتابخانەی مەحموودیە.

- زۆربەی قوتابییانی کوردی هەولێریی دەرچووانی قوتابخانەی روشدیە یا مەدارس دەچوونە دارالمعلمین ابتیدائیسی لە مووسڵ و حقووق کولیەسی لە مووسڵ.

- لەسەر لاپەڕەکانی گۆواری «کوردستان» لە ئەستەمبوڵ بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، پارچە شیعرێک بە ناونیشانی (دەلالیا زارۆکان) بۆ منداڵان، بە قەڵەمی «زینۆ» ناوێک (ئەمین عالی بەدرخان؟) لە ژمارە(٦)دا بڵاو کراوەتەوە.

- دەرکەوتنی رەسم و تەختیتەکانی یەکەم نیگارکێشی سلێمانی، حەسەن فەلاح: تابلۆی (شەڕی دەربەندی بازیان) دروست دەکات کە باسی شەڕی شێخ مەحموود و ئینگلیزەکان دەکات لە دەربەندی بازیان.

- بایەخدانی گۆواری ( ژین) و (کوردستان) لە ئەستەمبوڵ بە تەختیت و وێنە: بڵاوکردنەوەی وێنەیەکی فۆتۆگرافی (شەریف پاشا) و (ابراهیم الحیدری) و تابلۆیەکی (صلاح الدین الایوبي).

کورد و وەدەستهێنانی مافە رەواکانی کورد.

- عارف پاشا، لە قاهیرە، لەلایەن دەستەیەکی کوردانەوە، لە رێگەی کۆمەڵەی تەعالیی کوردستانەوە هەڵبژێردراوە کە بچێت بۆ پاریس و لەگەڵ شەریف پاشا تەقەلایان یەک بخەن.

- کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان، لە ئەستەمبوڵەوە ئەندامێکی چالاکی خۆی ناردووە بۆ پاریس بە ناوی (فەخری بەگ)، بۆ ئەوەی یارمەتیی شەریف پاشا بدا و هاوکاریی بکا لە کاروبارەکانیدا.

- کوردەکانی تورکیا و کۆمەڵە سیاسییەکانی کوردی لە ئەستەمبوڵ توانیبوویان بە ناوی خۆیان و هەموو کوردەکانەوە وەکالەتنامە بۆ شەریف پاشا بنێرن و بیکەنە نوێنەری خۆیان لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس. ئەمە هەنگاوێکی گەورە بوو کە لەلایەن (شەریف پاشا)وە بەرەو ئیستیقلال و سەربەخۆیی کوردستان هاوێژرا. گرینگترین ئەو کۆمەڵە سیاسییانەی، جگە لە شێخ مەحموود، پشتگیری شەریف پاشایان کردبوو، ئەمانە بوون: (تەعاون و تەرەقی کورد)، (تەعالیی کوردستان)، (هیوا)، (تەشکیلاتی ئیجتماعی)، (فیرقەی دیموکراتی کورد)، (جەمعیەتی ئیستقلالی کوردستان).

- رقەبەرایەتیی ئەرمەنییەکان لەگەڵ شەریف پاشا، لەسەر دیاریکردنی سنووری ئەرمەنستان و کوردستان توندوتیژتر دەبێ.

۱۹۱۹/۷/۲۹ و ۱۹۱۹/۱۰/۹: دوو نامە دەنێرێ بۆ رۆبەرت فانسیتارتی سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانەی بەریتانیا لە پاریس بۆ ئەوەی بیخاتە بەردەم بلفۆری وەزیری دەرەوەی بەریتانیا.

- راپەرینی سمکۆ ئاغای شکاک.

- لە کاتێکدا هەموو کوردستانی عێراق لەژێر دەستی ئینگلیزدایە، راپەرینەکانی شێخ مەحموود دژی ئینگلیز لە سلێمانی و دەوروبەری دەست پێ دەکات، کە (مەحموودخانی دزڵی) لە کوردستانی ئێرانەوە هاوکارییان دەکا کە لە ۱۹۲۰ ئێران دەیگرێت و بەو تۆمەتە دووری دەخاتەوە بەرەو هیندستان. لە ۱۹۱۹/٥/۲ ئینگلیزیان لە سلێمانی دەرکرد



ئەحمەد موختار بەگی جاف شاعیر، نووسەری (مەسەلەی ویژدان)

- بەستنی پەیمانی (سنت ڕیمۆ) لە نێوان فەڕەنسا و بەریتانیا: کوردستانی باشوور دەلکێندرێتە دەوڵەتی عێراق. مێجەرسۆن کرایە حاکمی سلێمانی. نەوتی کوردستان دابەش کرابووە سەر بریتانیا، فەڕەنسا، ئەڵمانیا.
- سەرنووسەری ڕۆژنامەی ژین، هەمزە بەگ، لە ئەستەمبوڵ، لەسێدارە دەدرێ.
- لە ١٩١٩/٦/١٩ شێخ مەحموود لە شەڕی دەربەندی بازیان بەدیل دەگیرێ و حکوومەتی یەکەمی شێخ مەحموود کۆتایی دێت.
- بۆ یەکەم جار ئینگلیز ئۆتۆمۆبیلیان هێنایە سلێمانی.

## ١٩٢٠

- لە ١٩٢٠/٦/١٧ حکوومەتێکی عەرەبی بەناوی عێراق ڕاگەیەندرا. عەبدولڕەحمان گەیلانی دەبێتە یەکەمین سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراق.
- مەلا فەندی لە هەولێر پشتیوانی ئینگلیزەکان بوو.
- سمکۆئاغای شکاک بەشێکی کوردستانی ئێرانی ئازاد کردووە، ڕۆژنامەیەک دەردەکا (کورد) لە ورمێ.
- لە١٩٢٠/٨/١٠: ئیمزاکردنی پەیمانی سیڤەر لە نێوان تورکیا و دەوڵەتە هاوپەیمانەکاندا کە لەسەر بنچینەی داخوازییەکانی جەنەڕاڵ شەریف پاشا هەڵچنرابوو. لە بەندی (٦٢ و ٦٣ و ٦٤)ی پەیمانەکەدا، بەڵێنی سەربەخۆیی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی درابوو. تورکیاش بۆ دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە ڕەزامەندیی پێشان دابوو.
- ١٩٢٠/٤/٢٧: جەنەڕاڵ شەریف پاشا، لە ناکاو، نامەیەک بۆ وەفدی بەریتانیا لە پاریس دەنێرێت و بۆی ڕوون دەکاتەوە کە چیی تر سەرۆک وەفدی کوردان نابێت و نوێنەرایەتی کوردان ناکات لەم کۆنفرانسەدا: ئەمەش لەبەر ئەو ناکۆکییانەی کە لەگەڵ شێخ عەبدولقادری سەرۆک کۆمەڵەی کوردان لە ئەستەمبوڵ هەیەتی.

١٩٢٠/٣/٢٣: وەزیری دەرەوەی بەریتانیا نامەیەک بۆ مەندووبی سامی لە بەغدا دەنووسێت، تێیدا ڕوون دەکاتەوە کە حکوومەتی بەریتانیا ئامادەیە دەوڵەتێک بۆ کورد دروست بکا بە سەرۆکایەتیی شەریف پاشا، بەڵام ئاخۆ ئێوەی حکوومەت کەسی تری شایستە دەبینن کە ببێتە سەرۆکی





قەدری جان. شاعیری کوردی سووریا

## ١٩٢٠

- مێجەرسۆن یەکەم چاپخانە بۆ کوردستانی عێراق دەهێنێتە سلێمانی و لەوێ ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە ١٩٢٠/٤/٢٩ دەردەکا تا ١٩٢٢/٧/٢٧ بەردەوام دەبێ. لەسەر لاپەڕەکانیدا (٥٠) شیعر بڵاو دەکاتەوە و بۆ یەکەم جار کۆمەڵێک چیرۆکی وەرگێردراو لە ئینگلیزییەوە بڵاو دەکاتەوە لەگەڵ چەندان چیرۆکی خۆماڵی. هەروەها پێشبڕکێیەک دادەنێ بۆ ئەو نووسەرانەی کە بە پاکترین و پەتیترین کوردی دەنووسن؛ سێ خەڵاتیشی دانابوو.
- یەکەم کتێبی چاپکراوەی ڕەسمی لە کوردستانی عێراقدا کە بۆ قوتابخانەکان ئامادە کرا و بڵاو کرایەوە، نووسراوی مامۆستای قوتابخانەی نموونەی سەعادەت، محەمەد باشقە (١٨٩٠ ـ ١٩٨٠) کە بە هاوکاریی مێجەرسۆن و محەمەد زەکی دایناوە بە ناونیشانی (ئەوەڵەمین قیرائەتی کوردی) لە ساڵی ١٩٢٠دا لە چاپخانەی حکوومەت لە بەغدا چاپ کراوە. ئنجا لە ١٩٢٦ لەلایەن ئەحمەد عەزیز ئاغاوە ( ئەلف و بێ ) لە جیاتی (ئەوەڵەمین قیرائەت) بۆ پۆلی یەکەم دانرا.
- دامەزراندنی "لیژنەی فەن و تەمسیل" لە قوتابخانەی

ئەو دەوڵەتە کوردییە؟

٢٥/٣/١٩٢٠: وەڵامی مەندووبی سامی لە بەغداوە: «هیچ کوردێک نییە کە بتوانێ بەناوی هەموو کوردستانەوە قسە بکا»، «کورد بەشێوەیەکی گشتی هەستی عەشایەرییان هەیە، نەک نەتەوەیی».

- پەیدابوونی جیاوازیی بۆچوون و ئایدیۆلۆجیای دژ بەیەکتر لەناو کورداندا. بۆ نموونە، شێخ عەبدولقادری شێخ عوبەیدوڵای نەهری دەستی کردە برووسکە ناردن بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس داوای ئۆتۆنۆمی کرد لە جیاتی پێکهێنانی دەوڵەتە سەربەخۆکەی شەریف پاشا. هەروەها هەر یەکێک لە فەڕەنسا و بەریتانیا رێگە چارەی جیاواز و دژ بەیەکیان هەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد



عەبدولواحید نووری



ئەربیل نوولای هەولێر کە یەکەم لیژنەی نواندنی شانۆیی پێک هێنا لە کوردستاندا.

- لە ١٧ی مانگی ئۆگەستی ١٩٢٠، لە سلێمانی «لە مەکتەبی نموونەی سەعادەت قوتابی قەید و قبووڵ دەکرێ و لە یەکی مانگی سێپتەمبەری ١٩٢٠ رۆژی چوارشەمە مەکتەب دەکرێتەوە و دەست بە دەرس خوێندن دەکرێ. حکوومەت کتێب، دەفتەر، قەڵەم، کاغەز، مەرەکەب، تەباشیریان دەداتێ».

- مەمدووح سەلیم (١٨٨٠- ١٩٧٦) رۆشنبیرێکی تری کوردی فەڕەنسیزانە، کە لە ئەستەمبوڵ پێگەییوە. لەوێ فەلسەفەی خوێندووە و ئەندامی رێکخراوی هێڤی و (جەمعیەی تەعالی و تەرەقی) بووە. لە ١٩٢٠ ئەستەمبوڵ جێ دێڵێ بەرەو دیمەشق بۆ کارکردن لەناو رێکخراوی (خۆیبوون)دا.

- ئاڵای کوردستان لە ١٩٢٠ داهێندراوە لە ئەستەمبوڵ لەلایەن رێکخراوی (کورد تەشکیلات ئیجتیماعیە جەمعیەتیسی) کە هەر ئەو ساڵە لە رێکخراوی (کوردستان تەعالی جەمعیەتی) کە سەرۆکەکەیان سەید عەبدولقادری نەهری بوو، جیا بووبوونەوە.

ئەندامەکانی (کورد تەشکیلات ئیجتیماعیە جەمعیەتیسی) کە ئاڵای کوردستانیان داهێناوە، ئەمانە بوون: ئەمین عالی بەدرخان، مەمدووح سەلیم، عەبدولڕەحمان هەکاری، نەجمەدین حوسێن، لەگەڵ (زەینەلعابدین) ناوێک کە هەندێ سەرچاوە دەڵێن هەر ئەویش شێوە و ناوەڕۆکی ئاڵاکەی پێشنیاز کردووە. بەڵام نەبیندراوە ئاڵاکە چۆن بووە، یان ئاخۆ هەمان ئاڵاکەی (خۆیبوون) لە ساڵی (١٩٢٧) بووە؛ هەمان ئەم ئاڵایەی ئێستا بووە یان نا؟

- رۆژنامەی پێشکەوتن، کە لە سلێمانی دەردەچوو لە ژمارە ١٨ی رۆژی ٢٦ی ٨ی ١٩٢٠دا لە وتارێک بە ناونیشانی مەکتەب و خوێندندا مودیری مەکتەبی نموونەی سەعادەت، رەشید زەکی کابان ( ١٨٦٧ ـ ١٩٤٠ ) کە خۆی دەرچووی روشدیەی سلێمانی بوو و ئیعدادی عەسکەری لە بەغدا و دانشگای سوپای لە ئەستەمبوڵ تەواوکردبوو و مامۆستای بەکر سەدقی بووە و پاشان بووەتە مودیری



تێکۆشەرە کوردەکانی (بەختیاری)

روشدیەی سلێمانی و لە سەردەمی شێخ مەحمووددا بووەتە مودیری قوتابخانەی مەحموودیە. شێخ مەحموود لە ١٩١٩دا لەگەڵ سەید ئەحمەد مەرەخەسی دەیاننێرێتە لای شەریف پاشا و لە حەلەب دەگیرێن، لە ١٩٢٩دا دەبێتە مودیری قوتابخانەی ناوەندی لە هەولێر ـ سەرچاوەکەی مستەفا نەریمان) دەڵێ:

" لەسەر ئەمری حاکمی سیاسی لە ئیعتیباری رۆژی سێشەمەی ١٧ی مانگی ئۆگەستی ١٩٢٠ لە مەکتەبی نموونەی سەعادەت قوتابی قەید و قبووڵ دەکرێ و لە یەکی مانگی سێپتەمبەری ١٩٢٠ رۆژی چوارشەمە مەکتەب دەکرێتەوە و دەست بە دەرس خوێندن دەکرێ. حکوومەت کتێب، دەفتەر، قەڵەم، کاغەز، مەرەکەب، تەباشیریان دەداتێ و هیچیان لێ ناستێنێ ".

یەکێک لە مامۆستاکانی نموونەی سەعادەت محەمەد باشقە (١٨٩٠ ـ ١٩٨٠) بووە.

– کاتێ سوپای ئینگلیز عێراقی داگیر کرد و ئاگری شەڕ کوژایەوە، دەرگەی قوتابخانەکانیش کرانەوە. رۆژنامەی پێشکەوتن، کە لە سلێمانی دەردەچوو لە ژمارە ١٧ی رۆژی ١٩ی ٨ی ١٩٢٠دا معاونی حاکمی سیاسیی سلێمانی دەڵێ:

" بۆ زانین... مەکتەبی " نموونەی سەعادەت " کرایەوە و دەست کرا بە نووسین و گلدانەوەی قوتابییان. هەموو رۆژێ پێش نیوەڕۆ ـ بە سەعاتی عەرەبی ـ لە سەعات یەکەوە تا پێنج، پاش نیوەڕۆش لە سەعات هەشتەوە تا سەعات دە هەیئەتی مەکتەب لە مەکتەب دادەنیشن؛ قوتابی قەید و رادەگرن. بۆ ئەوەی منداڵتان هیچنەزان دەرنەچێ و بەخۆڕایی فێری خوێندن و نووسینی عەرەبی، کوردی، ئینگلیزی، فارسی و گەلێ شتی زۆر چاک بن، منداڵتان با سەعاتی زووتر بنێرن و قەیدیان بکەن و لەم بەشە باشە بێبەشیان مەکەن "

– زیوەر: (قصص الانبیاء ) (چیرۆکی ژیانی پێغەمبەران)، سلێمانی.

– لەدایکبوونی هەژار (١٩٢٠ - ١٩٩١)

## ١٩٢١

- تورکیا و هاوپەیمانەکان، بەپێی پەیمانی سیڤەر، کە دابوویانە کورد بۆ ئەوەی دەوڵەتیان بۆ دروست بکەن. لە گفتوگۆدان. ونستۆن چەرچل بیر لەوە دەکاتەوە کە دەوڵەتێک بۆ کورد دابمەزرێنێ.
- لە ١٩٢١/٣/٧: شێخ مەحموود نەفی کرا بۆ هیندستان.
- رەزا شا دەبێتە شای ئێران و هێزی سەربازیی خۆی پتەوتر دەکا بۆ لەناوبردنی بزاڤی نەتەوەیی کورد، سمکۆ شاری مهاباد دەگرێ.
- لە ٢٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢١: رێککەوتنی فەرەنسا و تورکیا لەسەر ئەوەی کە مەڵبەندەکانی (جەزیرە) و (کورداغی) لەلایەن تورکیاوە بدرێتە پاڵ سووریای ژێر ئینتدابی فەرەنسا. راپەرینەکانی دەرسیم دەست پێ دەکەن.
- ٢٢ی ئابی ١٩٢١: بەریتانیا ئەمیر فەیسەڵی کردە مەلیکی عێراق.
- پێشەوا قازی محەمەد هاوکاریی راپەرینەکانی سمکۆ دەکا.
- لە ١٩٢١/١٢/٦چەند ئەفسەرێکی کورد بەشدارییان لە دامەزراندنی سوپای عێراقدا کرد.
- ئەحمەد خواجە دەڵێ: " کۆمەڵەی لاوانی کورد " کە لە هەولێر لە ١٩٢١ دامەزرابوو، لە هەولێر شانۆگەریی سەلاحەدینیان پێشکێش کردووە. عەبدوڵا عەزیز کارگەچی و ئەحمەد فەخری سامی و عەبدوڵا سامی ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە بوون و بەشدارییان لەو شانۆگەرییەدا کردووە. بڵاوکراوەیەکی دەسنووسی رەخنەیی توندوتیژیان هەبوو.
- لە ساڵی ١٩٢١ داهاتی ساڵانەی تووتن لە شاری سلێمانی دوو ملیۆن پاوەنی ئیستەرلینی بووە. تەنیا شێخ مەحموود خۆی سێسەد هەزار پاوەنی ئیستەرلینی هەبووە، جگە لە زەویوزار و مەروماڵات.

## ١٩٢٢

لە کاتێکدا شۆرشی شێخ مەحموود لە کوردستانی عێراقدا دژی ئینگلیز هەڵگیرساوە و لایەنگیریی تورکیای پێ خۆشە، لە کوردستانی تورکیاشدا نوێنەرەکانی شۆرشی کورد لە



## ١٩٢١

- ئەمین فەیزی کتێبی (ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد) کە یەکەمین تۆژینەوەی چاپکراوە لەبارەی شیعر و شاعیری، لە ئەستەمبوڵ چاپ دەکا: (لە ١٨٩٦ نووسیبووی).
- ئەسیری، دوای گەرانەوەی لە ئەستەمبوڵ، دەست دەداتە نووسینی ئەو جۆرە شیعرەی کە لەچاو شیعری کلاسیک جیاواز بووە.
- لە ١٩٢١ کتێبی ( هینکەری زیمانی کوردی) کە نامیلکەیەکی ٦٥ لاپەرەییە بۆ فێرکردنی زمانی کوردی، واتە بۆ دەرسدانەوەی زمانی کوردی بە زمانی تورکی و بە هەردوو دیالیکتی ژووروو و خواروو، لە ساڵی ١٩٢١ لە ئەستەمبوڵ لەلایەن رێکخراوی خوێندکارانی (هێڤی)یەوە لە چاپخانەی (نجم استقبال)دا چاپ کراوە .
- کارەساتی حەسەنە شەل و گۆرانییە ناودارەکەی شەهابە لەبارەیەوە. حەسەنەشەل بە فیتی عەلی پاشای دۆغرەمەچی دەچێ کاروانی ئینگلیزەکان لە رێی مووسڵ رووت دەکاتەوە. ئەوانیش دەیگرن و لە بەردەم سەرای هەولێر قەنارەی بۆ هەڵدەواسن.
- گۆران، تەمەنی (١٦) ساڵە، لە ژمارە ٦١ی پێشکەوتن، یەکەمین نووسینی خۆی: (ئەسەفی ماضی) و ئەندێشەی ئیستیقبالم.. بڵاو دەکاتەوە.
- دەرکەوتنی یەکەمین شیعرەکانی بێکەس و ئەسیری و کەماڵی (عەلی باپیر ئاغا) .
- لەدایکبوونی هێمن (١٩٢١ - ١٩٨٦)
- لە (١٩٢١- ١٩٢٢) عەزیز سەلیم لە کەلار، بە خەڵووز لەسەر دیواری ماڵ و مزگەوتەکاندا رەسمی کردووە.

## ١٩٢٢

شانۆگەریی (قەراڵیچە)، کۆمەڵە گەنجێک لە شاری هەولێر پێشکێشیان کردووە.
- - لە بیستەکاندا لە گەرەکێکی شاری هەڵەبجە جێگەی تایبەتی بۆ پێشاندانی شانۆگەری هەبووە.
- هەفتەنامەی بانگی کوردستان ( سلێمانی، ژ ١: ١٩٢٢/٨/٢٢ - ژ ١٤، ١٩٢٣/٦/٨)، زمانحاڵی (جەمعیەتی کوردستان)، بە چاپخانەی مێجەرسۆن چاپ دەکرا. خاوەن

تورکیا - ئەوانیش رادەگەیەنن کە «نایانەوێ کوردستان لە تورکیا جودا ببێتەوە». نوێنەرە کوردەکانی هەموو شارەکانی بەتلیس و وان و دیاربەکرو مەلاتیا و دەرسیم و ئورفە. ئەمەیان راگەیاند.

– سمکۆ رای دەگەیەنێ کە «شای کوردستانی ئێرانە»

– شێخ مەحموودی نەفیکراو لە هیندستانەوە دەهێننەوە بەغدا و پاشان بۆ سلێمانی کە لە ١٩٢٢/٩/١٤ دەبێتەوە «مەلیکی کوردستان».

– ١٩٢٢/١٠/١٠ حکوومەتی دووەمی شێخ مەحموود لە سلێمانی و دەوروبەری رادەگەیەندرێ کە تا ١٩٢٣/٣/٣ بەردەوام دەبێ.

– لە ١٩٢٢/١٢/١٦ مستەفا کەمال ئەتاتورکی کوردکوژ دێتە سەر حوکم.

– مستەفا پاشا یامولکی (١٨٦٨ ـ ١٩٣٦) میر لیوا لە سوپای عوسمانیدا، سەرۆکی جەمعیەتی کوردستان ١٩٢٢، وەزیری مەعاریف لە حکوومەتەکەی شێخ مەحموودا ١٩٢٢، خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەری رۆژنامەی بانگی کوردستان. باوەڕی بە پان ئیسلامیزم هەبوو ( ب. ک. ژ ١٢)، بۆیە دوژمنایەتیی کەمال ئەتاتورک و جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقیی دەکرد و دەمڕاستی لایەنگرانی ئینگلیز بووە دژی تورک.

– کۆمەڵەی کوردستان لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٢٢ کە مستەفا عەزیز پاشا و رەفیق حیلمی و ساڵح قەفتان و ئەحمەدبەگ و شوکری عەلەکە دایان مەزراندووە و گۆوارێکیان بە ناوی (بانگی کوردستان) دەرکردووە. ئامانجی سەرەکییان بریتی بووە لە پشتیوانیکردنی شۆڕشی شێخ مەحموود.

## ١٩٢٣

لەسەر داخوازیی لینین، ناوچە کوردنشینەکانی یەکەتیی سۆڤیەت، وەک مەڵبەندێکی سەربەخۆی سیاسی، ئۆتۆنۆمیی خۆی و ئیدارەیەکی ئۆتۆنۆمی پێ دەدرێت بە ناوی (کوردستانی سوور) کە پایتەختەکەیشی بریتی بوو لە شاری (لاچین) لە ناوچەی Nagoron - Karabakh )، کورد خۆیان بەڕێوەیان دەبرد.

ئیمتیاز و مودیری مەسئوول: مستەفا پاشا یامولکی.

– هەفتەنامەی رۆژی کوردستان (سلێمانی، ژ ١: ١٩٢٢/١١/١٥ـ ژ ١٥: ١٩٢٣/٣/٢). بە کوردی و فارسی و تورکی، زمانحاڵی (کۆمەڵەی کوردستان)، خاوەن ئیمتیاز و مودیری مەسئوول: شێخ نووری شێخ ساڵح .

عەلی کەمال باپیراغا لە ژ ١٨ی ژیانەوەدا:

ئەوساکە وەسانیت لە عێراقا هەمووی کەر بوو
لۆکس نەبوو ناویشی قتووی نەوت و فەنەر بوو
ئەم خەلقە هەموو دەربەدەر و خەستە جگەر بوو
بێ مەعریفەت و سنعەت و بێ عیلم و هونەر بوو
ئێستاکە طیارە هەیە من لە کەرم چی؟
من تازە لە تورکی قەبە و بێ هونەرم چی
چۆن تازە فەرامۆشی دەکا کوردی عێراقی
زوڵم و ستەمی تورک و جەفا و جەور و نیفاقی

## ١٩٢٣

هەرێمی ئۆتۆنۆمی (کوردستانی سوور) بۆ ماوەی پێنج ساڵ، واتە تا ١٩٢٩ رۆژنامەیەکیشیان بە ناوی (کوردستانی سوور Sovetskia kurdistan) بڵاو دەکردەوە. هەروەها پەخشێکی رادیۆ بە زمانی کوردی لە ناوچەی خودموختاری کورد لە یەکەتی سۆڤیەت تا ساڵی ١٩٢٩ بەردەوام بوو.

## ١٩٢٣/٧/٢٣

لە کۆنفرانسی (لۆزان) ئەتاتورکی کوردکوژی سەرۆک کۆماری تورکیا رای گەیاند «تورکیا تەنیا هی تورکانە»: خەونی دەوڵەتی کورد کۆتایی هات.

– نووسەر و شاعیرانی کورد، دوای قەدەخەکردنی زمان و کولتووری کوردی و راوەدوونانی رووناکبیرە کوردەکان لەلایەن رژێمی تورکیاوە، پەیتا پەیتا لە ئەستەمبوڵەوە گەڕانەوە بۆ کوردستان: حوسێن حوزنی موکریانی، پیرەمێرد، ئیسماعیل حەقی بابان، رەفیق حیلمی، ئەمین زەکی بەگ.. بۆ کوردستانی عێراق: هەروەها برایانی بەدرخان و عوسمان سەبری و قەدریجان و جگەرخوێن بۆ کوردستانی سووریا.

### ١٩٢٣/٣/٤

بۆمبابارانی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە و وەدەرنانی هێزی شێخ مەحموود بەرەو ئەشکەوتی جاسەنە. لە ١٦/٤ ئینگلیز هاتنەوە ناو سلێمانی. ئەو کاتە کە سمکۆ، ماوەیەک میوانی شێخ مەحموود بوو، لە ٢/٢٨ گەڕایەوە کوردستانی ئێران.

١٩٢٣/٧/٢٣: لە کۆنفرانسی (لۆزان)دا، دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە کوردەکان نایانەوێ لە تورکیا جودا ببنەوە و تورکیاش بەڵێن دەدات کە مافە نەتەوەییەکانی کوردەکان وەدی بهێنێت؛ لە پەیماننامەی (لۆزان)دا بەندەکانی (٦٢ و ٦٣ و ٦٤)ی پەیماننامەی سیڤەریان هەڵوەشاندەوە و خەونە جوانەکەی شەریف پاشایان زیندەبەچاڵ کرد.

- بەپێی پەیمانی سیڤەر (١٩٢٠ کە تێیدا بەڵێن درابوو دەوڵەت بۆ کورد دابمەزرێ) هەڵوەشێندرایەوە: کێشەی کورد لە عێراق لکێندرایە عێراقەوە، لە ئێران سپاردرایە دەستە خوێناوییەکانی شای ئێرانەوە، لە تورکیاشدا کەمال ئەتاتورکی کوردکوژی سەرۆک کۆماری تورکیا ڕای گەیاند «تورکیا تەنیا هیی تورکانە»

### ١٩٢٣/٧ ١٩٢٤/٧/١٩

حکوومەتی سێیەمی شێخ مەحموود لە سلێمانی.

### ١٩٢٤

کەمال ئەتاتورک لە تورکیا بەیەکجاری زمان و کولتووری کورد و جەژنی نەورۆزی قەدەخە کرد، هەرچی ڕووناکبیر و گەورەپیاوی کورد هەبوون یان ئیعدامیکردن یان نەفی یانیش ناچاری کردن خۆیان ڕابکەن لەدەست سێدارە: بەرەو ئەورووپا و شام و عێراق و ئێران. لەشکری تورکی بەردایە گیانی کورد.

- هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پەرلەمانی عێراقی کە تێیدا (١٧) کورد ئەندام بوون

- دووبارە بۆمبابارانی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەوە و دووبارە گرتنەوەی سلێمانی کە پێشتر شێخ مەحموود هاتبووەوە ناوی بۆ حوکمڕانیکردن. لە ١٩٢٤/٧/١٩ بەیەکجاری کۆتایی بە دەسەڵاتی شێخ مەحموود هات.



- یەکەم شانۆگەری لە سلێمانی، شانۆگەریی (عیلم و جەهل) لە ئامادەکردنی فوئاد ڕەشید بەکر، کۆمەڵە لاوێک پێشانیان داوە.

- لە سلێمانی، پێش ئەوەی هێشتا هیچ تیپێکی شانۆیی دابمەزرێت، شانۆگەریی دایک، نووسینی شێخ نووری شێخ ساڵح، قوتابیانی قوتابخانەی کچانی سلێمانی، لە سلێمانی پێشکێشیان کردووە.

- تیپێکی شانۆیی میسری، بە سەرپەرشتیی (بشارة واکیم)، لە سلێمانی و شارەکانی تری کوردستاندا نواندنی پێشکێش کردووە.

- بانگی حەق (سلێمانی: ئەشکەوتی جاسەنە نزیک سوورداش، ژ ١: ١٩٢٣/٣/٢٨- ژ ١٢: ١٩٢٣).

- هەفتەنامەی ئومێدی ئیستیقلال (سلێمانی، ژ ١: ڕۆژی ١٩٢٣/٩/٢٠- ژ ٢٥: ١٩٢٤/٤/١٥).

- شۆڕەتی سترانبێژ و لاوکبێژی کوردی تورکیا، عەبداڵ زەدینەکی، کە یەشار کەماڵ زۆر پێی کاریگەر و سەرسام بووە.

### ١٩٢٤

ڕووناکبیر و نووسەرانی کوردی ئەستەمبوڵ لە ١٩٢٤ بەملاوە، واتە دوای قەدەخەکردنی زمان و کولتووری کوردی و ڕاوەدوونانی ڕووناکبیرە کوردەکان لەلایەن ڕژێمی تورکیاوە، پەیتا پەیتا، گەڕانەوە بۆ کوردستان.

- ڕۆژنامەی ژیانەوە ( ڕ. سلێمانی /١٩٢٤ ـ ١٩٢٦).

- لە ١٩٢٤ کەمال ئەتاتورک بەیەکجاری زمان و کولتووری کوردی قەدەخە کرد، هەرچی ڕووناکبیر و پیاوماقووڵی کورد هەبوون یان ئیعدامیکردن یان نەفییکردن. لەشکری تورکیشی بەردایە گیانی کورد.

١٨-١١- ١٩٢٤: پیرەمێرد لە ئەستەمبوڵەوە بە شەمەندەفەر دەگاتەوە بەغدا. لەناو شەمەندەفەر ئەم شیعرە دەنووسێ:

ئەوا ڕووم کردەوە تۆ ئەی دایکی موشەفەق بیست و پێنج ساڵە
لە غوربەتدا بە یادی تۆ دەژیم خوا شاهیدی حاڵە

- عەلی مەردان، لەگەڵ محەمەد محەمەد سەعیدی هونەرمەند، هەردووکیان قەوانیان بۆ کۆمپانیای هۆمۆکۆرۆ Homokoro تۆمار کردووە.

## ۱۹۲۵

- سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکانی شێخ سەعیدی پیران کە لە کۆتاییی ساڵدا بە دیل دەیگرن و لە سێدارەی دەدەن.

- ١٦کانوونی دووەمی ١٩٢٥ لیژنەیەکی نێودەوڵەتی لەسەر داخوازیی کۆمەڵی گەلان گەیشتنە بەغدا بۆ ئەوەی بێنە کوردستان لەبارەی کێشەی ویلایەتی مووسڵ و کوردستان بکۆڵنەوە. کۆمەڵەی نەتەوەکان ڕازی دەبێت کە کوردستانی باشوور (ویلایەتی مووسڵ) لە سەر داخوازی بەریتانیا بدرێتە دەوڵەتی عێراق.

## ۱۹۲٦/٦/۲۲

ڕێککەوتنێک لە نێوان تورکیا و ئێران لە تاران: هەموو بزاڤێکی نەتەوەیی کوردی لەناو ببەن.



مێجەرسۆن



## شەوی ۳۰-۱-۱۹۲۵

پیرەمێرد، دوای ٢٥ ساڵ دوورەوڵاتی لە ئەستەمبوڵەوە دەگاتەوە سلێمانی.

١٩٢٥: حوسێن حوزنی موکریانی چاپخانەی (زاری کرمانجی)ی لە ڕەواندز دامەزراند، کۆوارێکیشی دواتر بەو ناوە دەرکرد. ناوبراو یەکەم نووسەری کوردی هاوچەرخە کە کتێبی خۆی بە نەخشەی جوگرافیای کوردستان و تەختیت و نیگار و وێنەی فۆتۆگرافی ڕازاندبێتەوە: (غنچەی بهارستان) زیاتر لە (٢٠) تابلۆی تێدایە. ئەمە یەکەمین کتێبی کوردییە کە گرافیک و وێنە و نەخشە بڵاو بکاتەوە.

- ١١ی ئاداری ١٩٢٥ کۆواری «دیاریی کردستان» لە بەغدا، ساڵح زەکی ساحێبقران، بە سێ زمان.

- ١/ ٧ /١٩٢٥: ڕۆژنامەی ژیانەوە ژمارە ٢٩-٢٦، پاشان لە ژمارە ١ی ڕۆژنامەی ژیان (٢٩/ ٧/ ١٩٢٦) تا ژمارە ٢٦، لە سلێمانی: یەکەم نۆڤلێتی کوردی بە زنجیرە بە ناونیشانی لە خەوما بە قەڵەمی جەمیل سائیب (١٨٨٧ـ ١٩٥٠) بڵاو دەکرێتەوە.

- دروستبوونی دیدەوانی لە سلێمانی

- یەکەمین تیپی مۆسیقا لە سلێمانی بە سەرپەرشتیی عەبدولواحد نووری و فوئاد ڕەشید بەکر.

- بەختیار زێوەر یەکەمین شیعرەکانی خۆی بڵاو دەکاتەوە.

- دەرکەوتنی چالاکی و گۆرانی و قەوانەکانی مریەم خان (١٩٠٤- ١٩٤٩)، حاجی عەبدوڵا دەفژەن (١٩٠٢- ١٩٦٣)، شەهابە (١٨٩١- ١٩٣٩)، سەبری موهاجیر (١٩٠٨- ١٩٨١).

- لە ئەرمەنستانی یەکیەتی سۆڤیەت، میکائیلی ڕەشید شیعری نوێ بڵاو دەکاتەوە.

- کتێبی (گۆرانیی کوردی) کە چەند سروودێکی نیشتیمانییە و ناوی نووسەری بەسەرەوە نییە.

- ئەحمەد ناڵبەند: جەسارەت لە ڕووی وەسفکردنێکی ڕووتی سێکس و لەشی ئافرەت.

- گۆرانیبێژ، مام هۆمەر، بۆ یەکەم جار لە مێژووی هونەری کوردیدا، لە بەغدا، قەوانی (هەی بەللار).

## ژیانی سیاسی

### ١٩٢٦/٢/١٢

- (عصبة الامم) داخوازیی له بەریتانیا کرد کە کورد بە زمانی خۆی بخوێنێت. نوێنەری باڵای بەریتانیا لە نامەیەکی نهێنیدا پێشنیازی بۆ سەرەک وەزیرانی عێراق کرد کە نووسینگەیەکی تەرجەمەی کوردی لە بەغدا بکرێتەوە، هەروەها تەرجەمەی قانوون و کتێبە قوتابخانەییەکان بۆ کوردی بکرێ.

- ئەحمەدی عەزیز ئاغا لە (١٩٢٦) لە رۆژنامەی (ژیان) یەکەم نووسەری کوردە کە وتاری لە دیدێکی مارکسییەوە نووسیوە، ئاماژە بە هەبوونی چینی دەوڵەمەند (بۆرژوا) دەدات لە سلێمانی، نووسەر هاتووە، کۆمەڵگەی، وەک مارکس، بەسەر دوو چینی کۆمەڵایەتیدا دابەش کردووە: (طەبەقەی خەواص) واتە هەڵبژاردەی کۆمەڵ: عولەما، ئەشراف، توجار، خاوەن موڵک و رووناکبیران.. کە ئەم چینەش دەتوانێ رۆڵی بزوێن ببینێت و کۆمەڵ بەرەو پێشەوە ببات؛ چینی دووەم: (طەبەقەی عەوام) واتە جووتیار و پاڵە و کرێکار و پیشەوەر و وردەواڵەفرۆش و کاسبکاری بچووک.

ئەم دوو چینە ناکۆکن لەگەڵ یەکتر و لە زۆرانبازیدان. ئەحمەدی عەزیز ئاغا نووسیویەتی: «هەردوو لا بە چاوێکی بێگانەیی و نەفرەتەوە تەماشای یەکتریان کردووە». ئەمەش هەمان ئەو تێگەیشتنە کە مارکس بۆ ململانێی چینی بۆرژوا و پرۆلیتاریا دەیکا.

## ژیانی کولتووری

- لەیلا بەدرخان ( ١٩٠٨ ئەستەمبوڵ- ١٩٨٦ پاریس) لە ئەڵمانیا قوتابخانەی باڵای هونەری بالیەی ئەڵمانی تەواو دەکات و دەست بە چالاکیی سەر شانۆ دەکا.

- گەلاوێژی ١٩٢٥

یەکەم فیلمی سینەمایی لە سلێمانی پێشان دراوە.

### ١٩٢٦

یەکەم جار چیرۆکنووسێکی کورد کۆمەڵە چیرۆکی خۆی بڵاو بکاتەوە: عیسا عەلی (حوسێن حوزنی موکریانی ؟): چیرۆک بەشێوەی شیمال (کەڵەکۆک)، رەواندز، ٥٥ لاپەرە، کەڵەباب؛ هەروەها حوسێن حوزنی موکریانی: خۆشی و ترشی، کورتە چیرۆکێکە بۆ منداڵان، گفتوگۆیەکە لە نێوان گورگ و مەڕ و بزنێک (یەکەم چیرۆکە بۆ منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا).

- دەرکەوتنی گۆواری زاری کرمانجی کە لە ماوەی تەمەنیدا ٧٨ شیعری بڵاو کردووەتەوە. هەر لەوێدا لە ژمارە (٥) بە پێنووسی (ز.ع. هەروتی) ژانرێکی شیعریی نوێ (پەخشانە شیعر) بڵاو دەکرێتەوە لەژێر ناوی (شیعری مەنسوور). هەر لەوێشدا دەرکەوتنی یەکەم کاریکاتێر.

- دەرکەوتنی رۆژنامەی ژیان لە سلێمانی ( ژ ١: ٢١/١/ ١٩٢٦_ ژ ٥٥٣: ١٠/٣/ ١٩٣٨).

- کۆمەڵەی زانستیی کوردان لە سلێمانی لە ٢٤/٢/ ١٩٢٦، کە ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگ و کەریم زانستی و رەفیق حیلمی دایان مەزراندووە. تیپی شانۆیی قوتابخانەی زانستی کە سەر بە جەمعیەی زانستی بوو لە سلێمانی چەندان بەرهەمی شانۆیی هەبووە.

_ شانۆگەرییەک بە ناوی جووتە برا (عیلم و جەهل لولا المحامي)، لە نووسینی (تقي الدين اللبناني)، لە هاوینی ١٩٢٦دا، لە سلێمانی پێشان دراوە. مەحموود جەودەت دەری هێنابوو. عەبدولواحید نووری و فوئاد رەشید بەکر دەوریان تێدا بینیوە.

- رەخنەی ئەدەبی و رەخنەی هونەری شێوەکاری، یەکەم جار شێخ نووری شێخ ساڵح (١٨٩٦_ ١٩٥٨) دایهێناوە. ئەمەش لەو زنجیرە وتارەی بە ناونیشانی "ئەدەبیاتی کوردی" لە رۆژنامەی ژیان بە ٢٥ ئەڵقە بڵاو کراوەتەوە لە سلێمانی. نووسەر لەم بەرهەمەیدا هەموو بەشەکانی هونەرە

جوانەکان صەنایعی نەفیسە (نیگارکێشان، مۆسیقا، پەیکەرتاشی، بیناسازی، وێنەکەری) بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا شی دەکاتەوە. شێخ نووری شێخ ساڵح یەکەمین نووسەری کوردە کە ڕا و تەنزیرات لەبارەی هونەری مۆسیقا و شێوەکاری دەخاتە ڕوو.

– ئەنجوومەنی مەعاریف جەلسەی حەوتەمی کردووە لە ۲۹ /۳ /۱۹۲٦ لە ریاسەتی موتەسەریفدا، بڕیار دراوە مەکتەبێکی کچان بکرێتەوە و لە ۲۱ی نیسانەوە دەست دەکرێ بە قەید و قبووڵی قوتابیی کچ.

– کۆمەڵی بژاری زمانی کوردی لە سلێمانی لەپێناو پاککردنەوەی زمانی کوردی لە بێگانە.

– لە هەولێر ناوی لیجنەی فەن و تەمسیل بووە لیجنەی فنوونی جەمیلە کە لە کۆتایی بیستەکاندا و سەرەتای سییەکاندا گەشەی سەند.

– لە ساڵی (۱۹۲٦) لەناو سیستەمی پەروەردەی هەولێردا لیژنەیەک بە ناوی (لیجنەی فەن و تەمسیل) هەبووە یان (لیجنەی فنوونی جەمیلە). هەروەها، بەپێی سجلاتی کۆنی پەروەردەی هەولێر، وانەی لیسانی فەرەنسەوی و مۆسیقا و رەسم و نال ئیشلەری و تەربیەی بەدەنی و حوسنی خەت دەخوێنرا. کەواتە، دەرسی مۆسیقا و هونەرە جوانەکان بەشێک بوونە لە پێداویستییەکانی خوێندن و پەروەردە لە هەموو شارەکانی کوردستانی عێراقدا.

– ژیان، ژمارە ۳، ٤ی شوباتی ۱۹۲٦، اعلان ل ٤: مەتبەعەی ژیان مستەعید و حاضرە بۆ طەبعی هەموو نەوعە جەداول و ئەوراقی حکوومەتی و هەموو نەوعە ئەوراقی تجاری و سیررێ. کاغەز و زەرف و سائیرە لەسەر طرازی تازە و بە وەقتی کاملە، وە بە فیناتێکی هەرزان. مراجەعەت بفەرموون، پەشیمان نابنەوە. بۆ ئەمە تەجروبە دەلیلمانە.

– ۱۸ی مارتی ۱۹۲٦: ژیان، ژمارە ۹؛ لە مدیریەتی مەطبووعاتەوە:

۱۷ شباط ـ لە مدیریەتی مەطبووعاتەوە خەبەرمان وەرگرتووە کە حکوومەت ئەمری داوە لە مەناطیقی کوردیەی عێراقدا لە دەوائیری حکوومەتدا لیسانی رەسمی دەبێ کوردی بێت و بەم نەوعە مەئموورەکانیش دەبێ کورد بن. وەزارەتی مەعاریفیش بۆ تەرجەمەی قەوانین و کتێبی



ح. ح. موکریانی

تەدریسیە بە کوردی دیوانێکی تەرجەمەی کردووەتەوە.

- ١٨ی مارتی ١٩٢٦: ژیان، ژمارە ٩، سەروتار: بۆ مەبعووثە محترمەکان: هەر لە سنجارەوە تا شارەزوور بڕوانن دوو مەکتەب، دوو صنعەتخانە، دوو ماکینەی تێدا نییە کە پێی ببێژری واسیطەی پێشکەوتن و مایەی هونەر. بۆچی، لەبەرچی؟ کۆیە، رەواندز، هەولێر، ئاکرێ، بادینان، دهۆک و زاخۆ و سنجار.. ئەمانە چی و بۆچی وا وێرانەن؟ بۆچی کوردستان هەر سلێمانییە ؟ ل ٢.

٩ی کانونی یەکەم ١٩٢٦: ژیان، ژمارە ٤٥، سەروتار: (کۆمەڵی بژاری زمانی کوردی) : مددەتی لەمەوپێش بە متاڵەعە و تەکلیفی رەئیسی جەمعیەتی زانستی کە جەنابی موتەسرفەی جەمعیەت قەراری دابوو کە لە منەوەران و هونەرمەندانی وەتەن تەشەککولی بکا کە کەلیماتی ئەجنەبی لە زمانی کوردیدا نەهێڵن و موقابیلی ئەو ئەمرۆ زۆر مستەعمەلە، لە ئەسڵی کوردی کەلیمات بدۆزنەوە و لە جێی ئەوان دابنێن. یەعنی بە کوردی (کۆمەڵی بژار) ئەو دانشمەندانە کە سزای ئەو کارە گەورەیە بوون لە طەرەف جەمعیەتەوە هەڵبژێرران و ئاگەدار کران رۆژی یەکشەمە سەعات دە لە مەرکەزی جەمعیەتدا کردبینەوە.

- کتێبخانەی کەشتیی نووح لە شەقامی سابوونکەران لەلایەن نەجمەدین مەلاوە دەکرێتەوە لە تەنیشت قوتابخانەی کەشتیی نووح ( ژین، ژمارە ١٦٦٧٨ رۆژی ٢٧-٣١ ١٩٦٢) دیوانی شاعیرەکانیشی نووسیوە و دەیفرۆشتن لە قوتابخانەکەشیدا هەرزەکارانی فێری خوێندەواری دەکرد، منداڵ هاوینان دەچوونە لای بۆ بەهێزکردنی ئاستی خوێندەوارییان.

- حەمدی ئەفەندی (١٨٨٧- ١٩٤٩) لە بەغدا چەند قەوانێکی گۆرانیی کوردی تۆمار دەکا لەوانە: ئای ئای، پیرەمەگروون موقەدەسی - کە شیعری زێوەر بووە و بە بیانۆ گوتراوە. ئەمەش لە رێگەی عومەر قەزاز، یەکەم وەکیلی کۆمپانیای قەوانی گرامافۆن لە سلێمانی کە داوای لە کۆمپانیای ئەبو چەلب Hismasters - voice کردبوو بۆ ئەم مەبەستە.

- عەبدولواحید ئاغای مستەفا کۆیی کە لە باندۆی مەلیکدا موعەلیم بوو، دوای کرینی داوودەزگای مۆسیقایی و



عەبدوڵلا گۆران



کامەران بەدرخان

## ١٩٢٧

سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکانی ئارارات بە سەرۆکایەتیی جەنەڕاڵ ئیحسان نووری پاشا کە تا ١٩٢٩ درێژەی کێشا

– لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧: «خۆیبوون».

پاش سەرکوتکردنی شۆڕشی ١٩٢٥ی شێخ سەعیدی پیران لە کوردستانی تورکیادا، سەرۆک عەشیرەتە شۆڕشگێڕ و بەرپرسی ڕێکخراوە سیاسییەکانی کورد، زۆربەیان، لەلایەن ڕژێمی ئەتاتورکەوە ئاوارەی عێراق و ئێران و سووریا و لبنان کران. لە کۆتاییدا پێوەندییان بە یەکتر کردەوەو بڕیاریان دا «کۆنگرەیەکی نەتەوەیی» ببەستن. یەکەم دانیشتنی کۆنگرە، لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دا پێنج ڕۆژی خایاند، لەوێ لەسەر پرەنسیپە بنچینەییەکان ڕێککەوتن، لە هاوینەهەواری (بیحەمدوون) لە لبنان، تا ٢١ی مانگ درێژەیان بە کۆبوونەوەکان دا. لەم کۆنگرەیەدا نوێنەرانی ئەم چوار ڕێکخراوە کوردییە بەشدار بووبوون: کورد میللەت فیرقەسی؛ کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعی کورد؛ کۆمیتەی ئیستیقلال؛ کۆمەڵەی کورد و کوردستان. بەپێی بڕیارەکانی کۆنگرەی یەکەمی دامەزراندنی (خۆیبوون) بڕیاریان دا کە هەموو کۆمەڵە و ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکانی پێشوو هەڵبوەشێننەوە و هەموویان بڕژێنە ناو ئەم کۆمەڵە تازەیەوە؛ یەکگرتوو، لە ڕێگەی ئەم کۆمەڵەیەوە بۆ سەربەخۆیی کوردستان تێ بکۆشن.



پیانۆ بۆ قوتابخانەیەکی سەرەتایی کوڕانی سلێمانی، بەخۆڕایی وانەی مۆسیقا و گۆرانیی بە قوتابییەکان گوتووەتەوە و فێری مۆسیقای کردوون.

## ١٩٢٧

یەکەم جار وێنەی ئاڵای کوردستان بڵاو کرابێتەوە، لە ساڵی (١٩٢٧) بووە ئەمەش لەسەر بەرگی هەندێ لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی (خۆیبوون) کە لە ساڵی (١٩٢٧) لە بەیرووت دامەزراوە. کەواتە، ئەگەر ڕێکخراوی خۆیبوون بە دامەزرێنی ئاڵای کوردستان داشنەندرێت، ئەوا دەکرێ بگوترێت: ڕێکخراوی (خۆیبوون) لەسەر بنچینەی هەوڵدانەکەی ساڵی (١٩٢٠) بۆ یەکەم جار ئاڵای کوردستانی چاپ و بڵاو کردووەتەوە. ئەمەش چونکە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ڕێکخراوی (کورد تەشکیلات ئیجتیماعیە جەمعیەتیسی) وەک مەمدووح سەلیم هاتن لەناو ڕێکخراوی (خۆیبوون)دا درێژەیان بە خەباتی سیاسی دا. دووەم جاریش، دیسان هەر یەکێک لە ئەندامەکانی (خۆیبوون)، جەلادەت بەدرخان، ئاڵای کوردستانی بڵاو کردووەتەوە، ئەمەش لە ساڵی (١٩٣٢) لەسەر بەرگی ژمارەیەکی کۆواری (هاوار) کە لە دیمەشق بڵاوی دەکردەوە.

## مانگی ئەیلوولی ١٩٢٧

– ئەو کاتەی مەجید یەعقوبی پارێزگار بوو، یەکەم قوتابخانەی کچان لە هەولێر لە گەڕەکی قەڵا لە نزیک دەرگەی ئەحمەدیە کرایەوە. تەنیا یەک پۆل بوو، ٢٥ قوتابی بوون. لە ١٩٢٨ پۆلی دووەم کرایەوە.

– مەحموود شەوقی، باوکی ئازاد شەوقی، لە سلێمانی، کاریکاتێر و رەسمی کردووە.

– کتێبخانەی عومەر قەزاز کتێب ڕۆژنامە و کۆوار و قەوانیشی دەفرۆشت

– ٤٤ قوتابخانەی کوردی لەسەر خاکی یەکەتی سوڤیەت لە کۆتاییی بیستەکاندا دامەزران.

– کابرایەکی ئەرمەنیی ڕەسسام، لە کۆتاییی ساڵانی بیستەکاندا لە هەولێر هەبوو، کوردی ئەودیو، ناوی جهانگیر، دانیال قەصابی هونەرمەند، لەژێر تەئسیری ئەودا



شێخ مەحموود لە تابلۆی (حەسەن فەلاح)دا



عادلە خانم

هاتە مەیدانی هونەر. هەروەها نیگارکێشێکی تر لە هەولێر کاری کردووە بە ناوی ئیسحاق هەولێری.

– بەختیار زێوەر شیعری گۆرانیی تانجەرۆ هەوڵدانێکە بۆ شیعری ئازاد.

– رەشید نەجیب بە ناوی (فەرامەرز) یەکەمین شیعرەکانی خۆی (عەشق و خەیاڵ) لە ژمارە (٩٤)ی ژیان دا، پاشان (ئالامی بەشەر) و (ئینتباعاتی هەورامان) هەر لە ژیان بڵاو دەکاتەوە. ئەوەی یەکەمیان بە نوقتەگۆڕانێک دەژمێردرێت لە ڕێڕەوی تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا.

– لەدایکبوونی دیلان (١٩٢٧ - ١٩٩٠)

– لە یەکەتیی سۆڤیەت و جیۆرجیا و ئەرمەنستانی یەکەتیی سۆڤیەت چەند فیلمێکی سینەمایی کوردییان لەبارەی کورد، لەناو ئەوانەدا فیلمی (زارێ)، دەرهێنانی: بێگ نەزارۆڤ کە ٧٢ دەقیقە، بێدەنگ، ڕەش و سپی، ی. دەرهێنەر: ئا. دانیەلان، بەرهەمهێنانی: ئەرمێنکینۆ، ئەکتەرەکان هەندێکیان کوردن، هەروەها کۆمەڵێک ئەکتەری ناوداری ئەرمەنستانی سۆڤیەتی وەکو: مانڤێلان، گۆلازیان، مەنووچەریان، بەرواری بەرهەمهێنان: ١٩٢٧، کاتی ڕووداوەکانی ناو فیلمەکە: ٤/ئاب/١٩١٤، شوێنی ڕووداوەکان: نێوان چیای ئەلەگەز و چیای ئاگری (سەر سنووری ئەرمەنستانی سۆڤیەت و کوردستانی تورکیا).

– پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠) بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، دەست دەداتە پێنووس و ژانری شانۆنامە (پیەس، تەمسیل، درام) بە خوێنەرانی کورد دەناسێنێ و یەکەمین ڕەخنەی شانۆیی بڵاو دەکاتەوە.

«فەننی تەمسیل، لە هەموو جێگەیەکدا رەغبەتێکی تەواو و ئیمتیازێکی موناسیبی دراوەتێ. حەتتا ئەوانەی کە لەم فەننە بەقیمەتەدا دەسدرێژی و ئیختیساسیان پەیدا کردووە، بە کەماڵی ئیحتیرامەوە یاد و تەقدیر کراون. زیرا ئەم فەننە، بەسەر ئەخلاقی میللەت، عاداتی مەملەکەت، ئەطوار و ئەفکاری ئینساندا تەئسیرێکی باش ئیجرا دەکا».

پیرەمێرد

ڕۆژنامەی ژیان، ڕۆژی سێشەمە، ٢ی ئاغستۆسی ١٩٢٧

**١٩٢٨/٦/١**

ئەمین زەکی بەگ، بە ئیمزای خۆی و ئیمزای عەبدولا موفتی (نائیبی هەولێر)، محەمەد ساڵح (نائیبی سلێمانی)، محەمەد جاف و سەعید وەنداوی ( نائیبی کەرکووک)، ئیسماعیل رەواندزی و مەعرووف جیاوک، یاداشتێکیان پێشکێش بە وەزارەتی مەعاریفی عێراق و پەرلەمانی حکوومەتی عێراق کرد بۆ ئەم داخوازییانە:

١ـ کۆمەڵێک دابنرێ بۆ دانان و وەرگێڕانی کتێبی قوتابخانەکان بە کوردی و هەرکەسێک کتێبی لەسەر دەستووری مەعارف کردە کوردی ٥٠٠ رووپیە بەخشیشی بدرێتێ.

٢ـ وەدەستهێنانی مامۆستا.

٣ـ لە مەنتیقەی شیمال دانیرەی مەعاریف بکرێتەوە و ئەویش دەبێ لە ناوەڕاستی مەنتیقەکەدا بێ.

٤ـ دەبێ لە مەنتیقەکەدا مەدرەسەی (دارالمعلمین) تەشکیل بکرێ.

٥ـ مەدرەسە بۆ ئیناث بکرێتەوە.

**١٩٢٨**

- رێکخراوی (خۆیبوون) لە رۆژی دامەزراندنییەوە تاکو ١٩٢٨/٦/٢٠ زیاتر لە (٧١) بەیاننامە و بانگەوازی بە تورکی عوسمانلی، فەرەنسی، عەرەبی، ئینگلیزی بلاو کردووەتەوە. یەکەمین چاپکراوی خۆیبوون لە شێوەی نامیلکە (کتێب)دا بە فەرەنسی و ئینگلیزی چاپ کراوە: (یاداشتنامەیەک لە بارەی کوردستان، لەگەڵ پاشکۆیەک)، قاهیرە: ١٩٢٨.



**١٩٢٨**

دانانی ئەلفوبێی کوردی لە ئەرمەنستانی یەکەتی سۆڤیەت.

- دووەم نۆڤلێتی کوردی، بە ناونیشانی مەسەلەی ویژدان، نووسراوی ئەحمەد موختار بەگی جاف.

- یەکەم وتاری تەرخانکراو بە زمانی کوردی لەبارەی رەسم لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانی کە ویستوویەتی رۆشنبیرییەکی شێوەکاری بە زمانی کوردی بلاو بکاتەوە.

زاری کرمانجی.

- پێشاندانی شانۆکەریی قەلەن (شیربایی) لە شاری تفلیس (لە کورجستانی یەکەتی سۆڤیەتی پێشوو).

- شانۆگەریی بەدرەوشتی: ئامادەکار: فوئاد رەشید بەکر، لە هەولێر ( زاری کرمانجی باسی دەکا).

- عەبە هەولێری (١٩٠٢-١٩٦٣) کتێبی (دەرسی ئەشیا)ی بۆ پۆلی پێنجەمی مەکتەب تەرجومەی کوردی کردووە.

- لە ١٩٢٨ لەلایەن سەعید سدقی حەسەن کابان (لە ١٩٠٠ مامۆستای قوتابخانەی نموونەی ئیبتیدائی، لە ١٩٠٣ مامۆستای روشدیەی عەسکەری، لە ١٩٠٤ مامۆستای مەحموودیە، لە ١٩٢٥ مامۆستای خالدیە بووە) (مختصر صرف و نحوی کوردی) لە ٧٦ لاپەڕەدا بۆ قوتابخانەکان بلاو کرایەوە. نووسەر لە پێشەکیی کتێبەکەیدا دەڵێ:

هەتا ئەم عەسرە ئەخیرە خوێندنمان لە مەکتەبا و نووسینمان بە کوردی نەبووە.. وەقتی لە تەرەف مەعاریف و میللەت پەروەرانەوە تەدریساتی مەکاتب و نووسینی مەکاتب کران بە کوردی لازم بەڵکو واجیب بوو کە قەواعید بۆ زبان بۆ نووسینی کوردی دابمەزرێنرێ.. ئەووەل تەئلیفە و قابلی تەنقیدە".

ئەم کەسانە لەلایەن مەعاریفەوە تەدقیق و پەسەندیان کردووە: مەلا ئەفەندی ( هەولێر)، مەلا محەمەدی کۆیە، سەید نووری بەرزنجی، ئیبراهیم حەیدەری، جەمیل زەهاوی، محەمەد ئەمین زەکی بەگ.

## ١٩٢٩

هەڵوەشاندنەوەی کۆماری سووری کوردستان کە ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی کوردان بوو بە بڕیاری لینین لە ١٩٢٣ لە ناوچە کوردنشینەکانی یەکەتیی سۆڤیەت دامەزرابوو، پایتەختەکەیشی بریتی بوو لە شاری (لاچین).

هەرێمی ئۆتۆنۆمی (کوردستانی سوور) بۆ ماوەی پێنج ساڵ، واتە تا ساڵی ١٩٢٩ ڕادیۆیەک و ڕۆژنامەیەکیشیان بە ناوی (کوردستانی سوور Sovetskia kurdistan) بڵاو دەکردەوە، بەڵام لە ١٩٢٩بەملاوە، کاتێ ستالین حوکم دەگرێتە دەست، بەهۆی سیاسەتی دکتاتۆریانەی ستالین لە هەمبەر کەمایەتییە نەتەوەییەکان، کورد هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەیان لێ دەسەندرێتەوە، دەسەڵات و تەنانەت مافە کولتوورییەکانیشیان کز و کزتر دەبێتەوە و لە هەندێ قۆناخدا هەر بەیەکجاری، لە سایەی ڕژێمی ستالینەوە، دەسڕێتەوە.

بە فەرمانی ستالین، هەرێمی «کوردستانی سوور» دەکەوێتە ژێر ڕکێفی بەڕێوەبردنی جیۆرجیا و ئەرمەنستان و ئازەربایجانەوە. ئیتر وردە وردە ڕاگواستنەوەی کورد و ئازاردانی کورد لە یەکەتیی سۆڤیەت دەست پێ دەکاتەوە بەتایبەتی لە کۆماری ئازەربایجاندا.



شێخ مەحموود، ڕەفیق حیلمی

## ١٩٢٩

ئینگلیز بۆ یەکەم جار (دەورەی سیاقە) خولی فێرکردنی هاژۆتنی ئۆتۆمۆبێلیان بۆ خەڵک کردەوە. شایانی باسە، عەلی کاور مۆڵەتی ژمارە (١)ی وەرگرتووە، ئەمەش لە ساڵی ١٩٢٩. «ئەو کاتە قەمەرە و لۆری دەگمەن بوو، تەنیا شاسی مۆدێل ١٩٢٩یان بۆ گواستنەوەی نەفەرات بۆ بەغدا بەکار دێنا کە هەیکەلی داریان بۆ دروست دەکرد.

- ئنجا لە ساڵی ١٩٢٩ فەتحوڵا عەباس عەلی (١٨٩٨ – ١٩٦٣) لە هەولێر بە یەکەم پۆلیسی مروور دامەزراوە تا ١٩٣٩.

- لاوکبێژی کورد لە کوردستانی تورکیا، عەبداڵ مووسا، کە یەشار کەماڵی ڕۆماننووس بە لاوکبێژ و سترانبێژێکی باش لە قەڵەمی دەدا.

- ڕەشید نەجیب لە ١٩٢٩ نازناوی (گۆران) دەداتە عەبدوڵا بەگی شاعیری نوێخواز.

- لە ئەرمەنستانی یەکەتی سۆڤیەت، کارلینێ چاچان «شیعری نوێ» بڵاو دەکاتەوە.

- تیپی نواندنی (مەکتەبی تفیضی ئەهلی)، بە سەربەرشتیی (حقي الشبلي) لە هاوینی ١٩٢٩ هاتوونەتە هەولێر و سلێمانی، شانۆگەرییان پێشکێش کردووە.

- لەدایکبوونی کامەران موکری (١٩٢٩– ١٩٨٦)

٥/٨/١٩٢٩: ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ١٩٠: وەزارەتی مەعاریف ئەم ساڵ بیست تەلەبە ئەنێری بۆ دارالفنونەکانی ئینگلتەرە، ئامەریکا، بەیرووت، میسر. ئەمانە لە فەننی تەربیە و تەعلیم، هەندەسە، ئەلکتریک و زراعەتدا تەحصیل دەکەن.

٧ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩: دوا بە دوای ئەوەی کە شانۆکەریی (وێنەتی) لە شاری هەولێر، لەلایەن قوتابییانی سانەویی هەولێر پێشکێش دەکرێت، حوسێن حوزنی موکریانی، لە (زاری کرمانجی) لە ژمارە ١٦دا، بایەخی شانۆ بۆ خەڵک ڕوون دەکاتەوە.

- دەفژەن و دەنگخۆشە ناودارەکانی ساڵانی بیستی هەولێر: شەهابە (١٨٩١– ١٩٣٩)، حاجی عەبدوڵا دەفژەن (١٩٠٢– ١٩٦٣)، عەزە قوونفش (عەزیز ئاغا ١٩٠٤–

١٩٥٩)، عوسمان حەیران (١٩٢٢- ١٩٦٧)، حاجی عەبدوڵای خەیاڵ (١٨٩٦- ١٩٦٩)، سەید محێدین سەید خەنجەر (١٨٨٠- ١٩٤٢)، مەلا نادری بێستانچی (١٨٨٦- ١٩٦٣)، لەگەڵ فەقێ سمایلی پەڵکانە (١٨٧٨- ١٩٤١).


پیرەمێرد


ع. ڕەحمی هەکاری

## ١٩٣٠/١/١

- ئەلفابێی لاتینی لە ئەرمەنستانی یەکەتی سۆڤیەت، کە لەلایەن عەرەبی شەمۆ و مارە گۆڵێفەوە دروست کرابوو، بەشێوەیەکی ڕەسمی کەوتە کار. پاشان لە ١٩٤٦ گۆڕا و بووە ئەلفابێی سلاڤی.

- ڕۆژنامەی ریا تازە (یەریڤان ١٩٣٠-١٩٣٨ و ١٩٥٥ - ١٩٩٣.

- لە مانگی مارتی ١٩٣٠، فوئاد ڕەشید بەکر، لە سلێمانی، کورتە نمایشێکی نیشان داوە بە ناوی (مامۆستای کۆن).

- قوتابخانەی کچانی هەولێر، بینایەکەی، جێگەی پۆلی چوارەمی تێدا نەدەبووەوە، بۆیە گواسترایەوە تەنیشت خەزانەی ناوەکەی ناو قەڵا. لە ١٩٣٢ - ١٩٣٣ پۆلی سێیەم کرایەوە و ناوی لێ نرا (مدرسة اربیل الابتدائیة للبنات).

- یەکەمین وێنەگرەکانی سلێمانی کە لەناو شار ستۆدیۆی وێنەگرتنیان لە ساڵانی (١٩٣٠)دا لە سلێمانی کردووەتەوە، ئەرمەنی و جوولەکە بوون.

- لە سەرەتای ساڵانی ١٩٣٠ کۆمەڵەی گەنجانی کورد لە پاریس: شانۆگەریی مەم و زین.

- ڕەشید نەجیب لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا زنجیرە وتارێک بە ناونیشانی (ئەدەبی کوردی) بڵاو دەکاتەوە و داوا دەکات کە بۆ بووژاندنەوەی ئەدەبیاتی نەتەوەییمان پێویستە بگەڕێینەوە بەرەو ئاڤێستا. داوا لە نووسەر و شاعیران دەکات کە بۆ تازەکردنەوە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ئەدەبیاتی فۆلکلۆری و کێشی پەنجە و بەیتە کوردییەکان «چونکە ئەم تەبەقەیە لە حسیات و خووی ڕەسەندا پاکترین تەبەقەی کوردن و لەگەڵ بێگانەدا تێکەڵ نەبوون، ئاسار و شیعرەکانیان نموونەیەکی خاوێن و ئەسڵێ ئەدەبیاتی کوردییە».

- لە ١٩٣٠/٦/٤ یەکەمین شیعری فەڕەنسی کە

تەرجەمەی کوردی بکرێ: شیعرێکی شاعیری پەرناس سوللی پرۆدووم بە پەخشان لەلایەن مەحموود جەودەتەوە بە ناونیشانی (نەهاری خوێنین) لە ژمارە (٢٣)ی گۆواری زاری کرمانجی بلاو کراوەتەوە.

– دیوانی مەلا محەمەدی کۆیی، ڕەواندز، چاپخانەی زاری کرمانجی.

– کۆمەڵەی لاوانی کورد لە بەغدا، کۆمەڵەی برایەتی لە سلێمانی: هەروەها لەناو قوتابخانەی فەیسەڵیەشدا لە سلێمانی: یەکەمین تیپی تۆپی پێ.

– لە ١٩٣٠ _ ١٩٣١دا لە ڕەواندز شانۆگەریی نیرۆن پێشان دراوە. کۆمیدیایەکی نۆ پەردە بووە، دوو ڕۆژ بۆ پیاوان، ڕۆژێک بۆ ژنان بووە.

– لە ١٩٣٠/٥/٢٠ یانەی سەرکەوتن لە بەغدا.

– لە ساڵی ١٩٣٠و ١٩٣١دا حکوومەتی عێراق یەکەمین شاندی قوتابییانی عیراقی دەنێرێت بۆ ئەوروپا بۆ خوێندنی هونەری شێوەکاری مۆدێرن: ئەکرەم شوکری و حافظ الدروبی بۆ بەریتانیا و فائق حەسەن بۆ پاریس. هەر لەو ماوەیەشدا نەسلێکی گەنجی عێراقی دەکەونە کاری شێوەکاریی مۆدێرن: جەواد سلیم کە لە ١٩٣٨ چووە پاریس و ئیتاڵیا و دوای خوێندنی پەیکەرتاشی، لە ١٩٤٦ گەڕایەوە بەغدا. هەروەها محەمەد ساڵح زەکی، عاسم حافز، عەتا سەبری، نووری مستەفا بەهجەت، جەمیل حەموودی، اسماعیل الشیخلي، خالد الجادر، فرج عبو کە زۆربەیان لە پەیمانگەکانی ئەوروپا خوێندبوویان و بوونە مامۆستای قوتابییە هونەرمەندە کوردەکانی ساڵانی ١٩٥٠ و کاریان کردە سەریان.

– شێخ نووری شێخ ساڵح، زاراوەی مەسەوڕ بۆ نیگارکێش و زاراوەی ڕەسم بۆ نیگار و تابلۆ بەکار دەهێنێت و پایەی بەرزی نیگارکێش لە کۆمەڵگەدا دەردەخات.



مۆسیقاژەنێکی کوردی ئورفە، ساڵانی ١٨٠٠

## ١٩٣١

بەستنی کۆنگرەی مۆسیقای وڵاتانی عەرەب لە قاهیرە کە عەلی مەردان بەشداریی تێدا کرد.

– عەلی مەردان و محەمەد گوبانچی دێنە هەولێر کۆیان

**١٩٣١/١٢/٩**

ڕاپەڕینی بارزان

**١٩٣٢**

- بەردەوامبوونی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکانی بارزان بە سەرۆکایەتیی (شێخ ئەحمەدی بارزانی) و مەلا مستەفای بارزان.



کچە کوردی لوڕستان، ساڵانی ١٨٠٠



لە شەهابە دەبێ.

- یەکەم چیرۆکی تەرجەمەکراو کە بە کتێب بڵاو کرابێتەوە: سەرهاتیا جاسم. حاجی جندی و ئەمینێ عەڤداڵ لە نووسینێکی لازۆی ئەرمەنییەوە کردوویانەتە کرمانجی، بە پیتی لاتینی: یەریڤان.

**١٩٣١**

- کوردی و مەریوانی، لە شاری بەغدا، پرۆژەی بڵاوکردنەوەی کتێب بە زمانی کوردی، یەکەم کتێبی چاپکراویان: دیوانی نالی، ئنجا دیوانی کوردی، لە بەغدا

- بەستنی کۆنگرەی مۆسیقا لە قاهیرە کە عەلی مەردان بەشداریی تێدا کرد.

**١٩٣٢**

دەرکەوتنی دانیال قەساب لە هەولێر وەک یەکەمین نیگارکێشی مۆدێرن.

- یەکەم پێشانگەی هونەری ڕەسم لە سلێمانی: عەزیز سەلیم یەکەم پێشانگەی تایبەتی خۆی لە قەبرستانی شێخ جەعفەر کردووەتەوە.

- حەسەن فەلاح، ئەو کاتە تەمەنی بیست و دوو ساڵ بووە، لەسەر دیواری ماڵ و چایخانە و دیواری ناوبازاڕەکان ڕەسمی دەکرد (لە سلێمانی و لە بەغدا).

- لە هەولێر (لیجنەی فنوونی جەمیلە) لە سانەویی هەولێر، توانی بۆ خۆی ژوورێک تەرخان بکا و مەرسەمێک (ستۆدیۆی ڕەسم) بۆ یەکەمین جار لە شاری هەولێر دابمەزرێنێ.

- پیرەمێرد شانۆنامەی مەم و زین (کە دەبێتە دووەم شانۆنامە لە ئەدەبی کوردیدا) لە ١٩٣٢ بە زنجیرە لە ژیان دا بڵاو دەکاتەوە. پاشان لە ١٩٣٥دا دەخرێتە سەر شانۆ.

- لە هەولێر، شانۆی کچی کوردستان لە ١٩٣٢ نیشان دراوە.

- لە ساڵی ١٩٣٢: (٩) شانۆگەری لە هەولێر، (٨) لە سلێمانی، (١) لە ڕەواندز، (٢) لە کۆیە پێشان دراوە.

- بڵاوبوونەوەی یەکەمین شیعرەکانی ئەمینی عەڤداڵ لە ئەرمەنستانی سۆڤیەت.



شاری وان، ساڵانی ١٨٠٠

١٠-٥-١٩٣٢: پیرەمێرد: تەفرە و چاو و ڕاوی پف هەڵدراو، ڕۆژنامەی ژیان، ژ (٣٣٨): کە هەوڵدانێکە بۆ تازەکردنەوەی شیعری.

– شێخ نووری شێخ ساڵح نازناوی «نوسووڵ شناس» دەداتە (شەهابە)ی گۆرانیبێژی هەولێری.

– حەیدەرە کەچەڵ (١٩٠٤- ١٩٧٩) لە سییەکان تا شەستەکانیش گۆرانیبێژێکی ناوداری هەولێر بووە.

– کوردی و مەریوانی کتێبێک بە ناونیشانی (گۆرانی و سرورودی کوردی) لە چاپخانەی (ایتام) لە شاری بەغدا بە زمانی کوردی بڵاو دەکەنەوە کە (٦٥) سروود و گۆرانیی کوردیی تێدایە.

– لە هەولێر (لیجنەی فەن و تەمسیل) بووە (لیجنەی فنوونی جەمیلە). ئەم لیژنەیە لە کۆتاییی بیستەکاندا و سەرەتای سییەکاندا گەشەی سەند. لە هەمان کاتدا، ئەم لیژنەیە لە (١٩٣٢ - ١٩٣٣)دا لە سانەویی هەولێر، توانی بۆ خۆی ژوورێک تەرخان بکات و مەرسەمێکی قشت (ستۆدیۆی ردسم) بۆ یەکەمین جار لە شاری هەولێر دابمەزرێنێ.

– لە ١٩٣٢/١١/٢٨ ئوم کەلسووم لەسەر داوای وەزارەتی ئیرشادی عێراقی لە بەغدا ئاهەنگی سازدا. وەزارەتی ئیرشاد شەهابە بانگهێشت دەکا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئوم کەلسووم گۆرانی بڵێ لە گازینۆی هیلال لە بەغدا.

– عەلی مەردان و شەهابە و محەمەد گوباتجی (ئوم کەلسووم داوا لە شەهابە دەکا) دەبێ بچنە کۆنگرەی مۆسیقایی لە قاهیرە. هەموویان دەچن کەچی شەهابە بۆی مەیسەر نابێ لەگەڵیان بڕوا.

– (١٩٣٢ - ١٩٣٤): حەسەن فەلاح لەگەڵ عەزیز سەلیم، لە سلێمانی، لەسەر دیواری قاوەخانەکانی ئەسحابە سپی (لە جادەی کاوەی ئێستا) تابلۆ و پۆرترێت دروست دەکەن.

– ١٩٣٢ _ ١٩٣٥: بڵاوبوونەوەی ٥٧ ژمارە لە گۆڤاری هاوار (ژ ١: ١٩٣٢- ١٩٣٥؛ ژ ٢٧: ١٩٤١- ١٩٤٣) لە دیمەشق. لەوێدا چەندان چیرۆکنووس و شاعیری نوێ دەردەکەون: کامەران بەدرخان، جەلادەت بەدرخان، مستەفا ئەحمەد بۆتی، عوسمان سەبری، قەدریجان، جکەرخوێن، نووردەدین زازا. کوردناسی فەرەنسی، ڕۆژە لسکۆ، ناو لەم

جموجۆڵە کرینگە دەنێت "قوتابخانەی دیمەشقی" لە ئەدەبی کوردیدا کە کۆوارەکانی ڕۆناهی ۱۹٤۲- ۱۹٤٥ و ڕۆژا نووش ٤٣-۱۹٤٦ دەگریتەوە کە لە ساڵانی ۱۹٤۰ لە شام دەردەچوون.

هاوار لە (٥٧) ژمارەی خۆیدا (۱۸۷) شیعری بڵاو کردووەتەوە. هەروەها چەندان هەوڵدان بۆ نووسینی شیعری ئازاد و بەکارهێنانی کێشی ئازاد بەتایبەتی لەلایەن کامەران بەدرخانەوە لە ساڵی ۱۹۳۲ لە (ژ ۸، ل ۳) شیعری (سترانا دلان).

- یەکێک لە ئەندامەکانی (خۆیبوون)، واتە جەلادەت بەدرخان، ئاڵای کوردستانی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، ئەمەش لە ساڵی (۱۹۳۲) لەسەر بەرگی ژمارەیەکی کۆواری (هاوار) کە لە دیمەشق بڵاوی دەکردەوە.

ئاشکرایشە، ئەو ئاڵایەی (خۆیبوون) هەمان ئاڵای کۆماری مهاباد نییە و هەندێک جیاوازییان هەیە.



سوارچاکی کورد، پۆستکارتێکی پارسی، ساڵانی ۱۸۰۰



سەرکردەیەکی شۆڕشی ئەرارات ڕووبەڕووی کەمال
ئەتاتورک، ١٩٢٥

# سەرچاوە

**فەرەنسی:**


Henry BINDER: Au Kurdistan, Maison Quantin. paris: 1887.

Le cte DE CHOLET: Armenie. Kurdistan et Mesopotamie. Libr. Relation d un Voyage du Levant, Imp. Royale. Paris:1717.

Stanford SHAEW: Histoore de L Empire pttoman et la Turquie,Tome. 1. ed. Harvath paris: 1983

Addai SCHER: Histoire Nestorienne Chronique de Seert, Archeveque Chaledeen du Kurdistan. Paris: 1909.

Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860.

CHODZKO: Etudes philologiques sur la langue Kurde - Dialecte de Suolemanie, in Journal Asiatique, No 4. Paris; 1857. 60 pages.

Morizio GARZONI: Grammatica e vocabulairio della lingua kurda. Rome: 1787.

:A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

A. JABA: Ballade Kurde recueillie et traduite par A. JABA et communiquee par DE TCHITIATCHEFF in Journal Asiatique, Paris: 1859, 5e Ser., T. XIV, P. 153-166.

Mierlla GALLETTI: Curdi e Kurdistan in operè italiana del XIII-XIX. in Riv. ORIENTO MODERNO, Anno LVII, Nr. 11; Nov. 1978, P. 563-596.

Raphael J. Bidawid: Les ettres du Patriarche Nestorien Thimote 1, Cittadel Vatican 1956.

A. JABA: Resume de l ouvrage d Ahmed Effendi Khani, Tr. par A. JABA, in Bulletin Hist. Philologique, LXV, 1858, No 11, P. 161-171.

CHODZKO: Etudes philologiques sur la langue Kurde - Dialecte de Suolemanie, in Journal Asiatique, No 4, Paris; 1857. 60 pages.

Alexandre JABA: Recueil de Notices et Recits kourdes, St Petersbourg: 1860

Pierre RONDOT: Publication Kurde en caracteres latins Hawar. Revue Kurde in Bulletin d Etudes Orientals de l Institut Francais de Damas, T2, 1933, P. 3.

Roger LESCOT: Litterature Kurde. PP. 795-805, in Encyclopedie de la Pleade. Histoire des Litteratures, Vol. 1. ed. Gallimard, Paris: 1977, P. 903.

Emir Kamuran BEDE-RKHAN: Le Roi Du Kurdistan. Roman Epique traduit du Kurde Par Emir Kamuran BEDE-RKHAN et Adolphe de FALGAIROLLE, ed. OPHRYSGAP. Paris: 193?. 84 pages.

Thoas BOIS: Connaissance des Kurdes, Khayat. Beyrouth: 1965, P. 133.

Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.

Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.- 24
C.Le STRANGE: The Lands of the Esterm caliphate Cambridge at the Uni versty Press. 1950 p. 192.
La. Turquie Col Lection Monde et Voyages Edition Larousse. Paris: 1974 pp. 20 -21.
Basile NILITINE Les Lurdes Ed . D. Aujourd hui Paris: 1956. p. 23.- 24
V. MINORSKY. "Kurdes.pp. 1196- 1222"in (Encyclopedie de L Islam) dictionnire Geographdique Rthog. et. Biog. des peuples Musulmand. Tome 2. E.L.A PICARD editeut. Pares 1927. p. 1220.
C.Le STRANGE: The Lands of the Esterm caliphate Cambridge at the Uni versty Press. 1950 p. 5
A.SPIEGEL Eranisch Alertuni Col. Kartsew.B- Chevalier CHARDIN: Voyages du ch CHARDIN EN Perse 4 vol Amsrtsame: 1735,reedite a paris (1811)
Notices et Extraits des MANUSCRITS de la Bibliotheque du Roi Publied Paar Linstitut Royal de France Tome 13e Imp Royal Paris 1838 p. 305
G. Le STRANGE Mesopotamie and Persea Under the Mangol.London: 1903 . pp ,5 27. 52. 57,
DRIVER DISPERSION of rhe kurds in ansient times in (Joumal of the Royal Asiats Society) october 1921 pp 563 572.
Gerard CHALIAND. Atlas de la decouverte du monde. ed Fayard. Paris 1983, pp. 62.
ROBERT OSLON: THE EMERGENCE OF KURDISH NATIONALISM (1880-1925) U.OF TEXAS PRESS. USA: 1989 P 15
REVUE DU MONDE MUSULMAN V.X , PARIS: 1910. N. IV P 578.
BULLETIN ARMENIEN. N 18-19-20. P. 4 , PARIS: MARS 1920
The Cambridge history of Iran.V.2. The Medien and Achamenian Period. ed. by ILya GESCHVITCH, Cambridge university Presse, London_ Newyork_ Sydney: 1968?.P354, 365_359.
Xenophon: Anabase:tome II. Livre IV- VII. Texte etabli et traduitr psar Paul Masqueray, ed. Societe d. edition (Les Belles Lettres), Paris :1967.p.18.
Herkol Azizan: kardox. le govari Hawar, jimre 32,L.4-7,Dimasiq: 1941.
Xenophon: Anabase. T.II.p.175-185:(Notes com plementaires) page N 7.
V.MINORSKY:(kurdes) in Encyclopedie de Islam, T. II, E-K. Paris: 1927.pp.1197-1196.
Hinna Fiee: Jalons pour une histoire de l Eglise en Iraq in >> Scriptorum Christianorum Orientalium, Lovan: Lovan: 1970. P. 110-112.
J. M. MERIGOUX: Un precurseur de dialogue islam-chretian: Frere Ricoldo, R. Th., 4, Paris: 1974.
E. B. SOEN: A short Anthology of Guran Poetry, in Journal of the Royal Asiatic Society. Pt 1, 1921, P. 57-81. توما بوا . T. BOIS: Coup d oeil sur la litterature kurde. Al `` machriq, Mars 1955, P. 206.
) Voyage d Ibn Battita, ed. et tr. francaise: C. Defremery et B. R. SAnguinetti. Paris. Vol. II. P. 134-138, 141-142.
Raphael J. Bidawid: Les ettres du Patriarche Nestorien Thimote 1. Cittadel Vatican 1956.
Hinna Fiee: Jalon Pour une histoire de Eglise en Iraq in "S.C.O". Lovan: 1970. P.110 - 112.
Less Six Voyages en Turquie et en Perse I er edition, Amstrdam chez johannes Van Someren, 1678.

**فارسی:**

- علی اکبر فیاض: گزنفن در بازگشت، مجلهء (یغما)، شماره (٥)، ص ٤٤٣-٤٩٣، طهران:٩٤٩٥١٩٥.
هاشم رضی، تاریخ مطالعات دینهای ایرانی، چاپ دوم، ١٣٧١ش، چاپخانەی خواجه، انتشارات بهجت، تهران. ص٩٢- ، ٩٣
- حبیب الله صمدی : کردستان در چهل هزار سال پیش، مجلهء (بغستان) جلد اول. شمارهء اول، ص ٣٨-٣٩. طهران : ١٩٦٣.
- عبیدالله ایوبیان: میر نوروزی ( تاریخچه هنر تئاتر در کردستان ایران ـ قرن نوزدهم)، مجله نشریه دانشکده ادبیات تبریز، شمارد ١٤، ص ٩٥ ـ ١٢٢.
- عبیدالله ایوبیان: چریکەی کردی، نشریه دانشکده ادبیات تبریز، شماره تابستان، ١٣٤٠. (١٩٦٣).
سید حسن ناصر واحمد مستوفی وعباس زریاب: اطلس تاریخی ایران دانشکاد طهران، طهران: 1971 (فصل ایلخانان ایران) ( ئەم کتێبە بە سێ زمانی فارسی و فەرەنسی و ئینگلیسی چاپ کراوە).
حبیب الله تابانی: هاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد، و: جەلیل گادانی، سلێمانی: ٢٠٠٨
- مرتضی راوندی: تاریخ اجتماعی ایرا، جلد ١، ص ٥٣٥.

**کوردی:**

- کورد لە کەیەکەوە خەریکە، و: لە تورکییەوە: عەلی عیرفان، بەغدا: ١٩٢٧، ٢٧ ل.
- محەمەدی مەلا کەریم: عەقیدەنامەی کوردیی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، گۆواری کۆڕی زانیاریی عێراق ـ دەستەی کورد، بەرگی هەشتەم، بەغدا: ١٩٨١.
- جەلیلی جەلیل: هەندێ سیمای ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووریی کورد لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم، و: ئەنوەر قادر محەمەد، ستۆکهۆڵم: ١٩٩٣.
- مامۆستا جەعفەر: شاری سلێمانی، بنکەی ژین، سلیمانی: ٢٠٠٦.
کەماڵ ڕەئوف محەمەد: یەکەم گۆرانیبێژی سەر قەوان کێیە؟، کوردستانی نوێ، ژمارە (١٢٧٢)، ڕۆژی ١٩٩٦/٤/٢٥
- عەبدولڕەزاق بیمار: مێژووی پەخشانی کوردی. بەغدا: ١٩٩٩
- ئەکرەمی مەحموودی ساڵحە ڕەشە: شاری سلێمانی، بەرگی دووەم، بەغدا: ١٩٨٩.
- ئەحمەد سەعید ئەحمەد: کورتەیەک لەبارەی هونەری خۆشنووسی، ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٩، س ١٩٨٦
- عبدالكريم المدرس: بنەماڵەی زانیاران، بغداد: ١٩٨٤.
- جەمال نەبەز: زمانی یەکگرتووی کوردی، بڵاوکراوەکانی یەکەتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا، بامبێرگ ( ئەڵمانیای ڕۆژئاوا): ١٩٧٦، ل ٧٨ ـ ٨٧.
- کەمال مەزهەر: چمکێک لەبارەی یەکەم چاپخانەی کوردی لە شاری سلێمانی، کتێبی (چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد). بەشی یەکەم، د.ڕ. ب. ک. بەغدا: ١٩٨٥، ل ١٥٣.
- کەمال ڕەئوف محەمەد: ئەدەبی نامەنووسینی کوردی، ٣ بەرگ، دەزگای ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٤
- عبدالرقیب یوسف: بەشێک لە ژیان و بەرهەمی ڕەنجووری، ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٧، س ١٩٨٥، ل ٦٢ ـ ٧٥.
مستەفا نەریمان: کتێبی کوردیی قوتابخانەکانمان، گۆواری ڕۆشنبیریی نوێ، ژمارە ( ١١٠)، بەغدا: ١٩٨٦، ل ٨٦ ـ ٩٦.
ـ نووسەرێک: مەکتەبەکانی سلێمانی، دوێنێ و ئەمرۆکە، گۆواری زاری کرمانجی، ژمارە (٢٢)، ٣٠ی نیسانی ١٩٣٠.
ـ نووسەرێک: پێشکەوتنی زانستی لە سلێمانی لە زۆر کۆنەوە، ڕۆژنامەی ژین، ژمارە ١٢٤٧، سلێمانی: ١٩٥٥.
محەمەد بایراقدار: ئیدریسی بدلیسی، شوکور مستەفا کردوویە بە کوردی، ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٩.
مشیحا زیخا: کرۆنۆلۆژیای ئەربێللا، کوردناسی ئەڵمانی، ئێدوارد زاخاو Edward Sachau لە ساڵی ١٩١٥ لە بەرلینی ڕۆژئاوا تەرجەمەی ئەڵمانیی کردووە و چاپی کردووە، و. لە ئەڵمانییەوە: عەبدولمونمین دەشتی، بنکەی چاپەمەنیی سەکۆ، بەرلین: ١٩٩٥.
د. عیزەدین مستەفا: سەرنجی لە زمانی یەککرتووی کوردی، بەغدا: ١٩٧١، ل ٣٥
- عەبدولا بابەکر حەمەد ئاغا: ڕۆژنامە و ڕێکخراوە کوردییەکانی تورکیا، لە تورکییەوە ئامادەی کردووە، کاروان، ژمارە ٦٤، ١٩٨٨

